# پێشەکی

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

ئەم پەرتوکە کە نووسیوومە باس لە کۆمەلێك روداو دەکات لە ژیانی محمدﷺ پێش ئەوەی ببێت بە پێغمبەر واتە پێش ٤٠ سالی کە مەرج نیە باس لە هەموو روداوەکانم کردبێت ، بەڵکوو کۆمەلێك روداون بۆ بەرچاو رونی موسلمانان ، چونکە وەك ئاشکرایە زۆربەی موسلمانان شارزایان هەیە لەسەر سەردەمی پێغمبەرایەتی و زیاتر دیقەت دەدەنە ئەو سەردەمە ، بەڵام ئەگەر سەیری هەندێك روداویش بکەین پێش وەحی و تێبفکرین زۆر سودی بۆمان دەبێت و زیاتر باورمان بەهێز دەبێت لەسەر راستی و دروستی ئەم پەیامبەرە گەورەیە وە هیوادارم لە سالانی داهاتوو بتوانم باسی قۆناغەکانی دیکەی ژیانی پێغمبەر ﷺ بکەم وە تاکە هۆکار وای کرد ئیستا باسی ئەو قۆناغە نەکەم ئەوە بوو ئەزمونێکی کەمم هەیە ، چونکە باس کردن لەسەردەمی پێغمبەرایەتی ئەرکی قورستر و پێویسنی بە زانیاری دەقیقتر هەیە ، بەلام ئەو روداوانەی پێش وەحی هاتوون هەموو زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەری و مێژوو شاهیدە و هیچ جێگای خیلاف نەبووە لای ئەهلی سونە و جەماعەت بۆیە راستگۆیانە بلێم بۆمن کارێکی ئاسانتر بوو لە ئیستادا وە هیوادارم بتوانم بەم پەرتوکە خزمەتێکی بچوکی ئەم ئاینە پیرۆزە بکەم کە دەرمانی مرۆڤایەتیە .

**فیصل رسول : ٢٠١٨/٣/١٠**

# مێژووی عەرەب

ئەگەر سەیری سەرەتای مێژووی عەرەب بکەین کە پێش زاینی بووە بە چەندین سەدە بەلام سەیری ٦٥٠ سال پێش زاین بکەین هەتا سالی ٥٢٥ زاینیش بکە کە ئەبرەهە هات بۆ روخاندنی کەعبەی پیرۆز عەرەب هەر ژێردەست بووە و هیچ هێز و توانایێکی نەبووە بەرگری لەخۆی بکات و ژیانی خۆی بپارێزیت ، ئەگەر کەش و هەوای ناوچەی عەرەبی نەبوایە کە گەرماو چەق بەستووە وزەحمەتە بۆ داگیرکردن ئەوا خەرابتریان بەسەر ئەهات لە مێژوو و وە لاوازتریش ئەبوون .

لە هەموو ئەو مێژووە پێش هاتنی ئیسلام پێش ماوەیێکی کەم شەر لە نێوان هۆزێکی عەرەب بە ناوی هۆزی ( شەیبان ) روویدا لەگەل فارسەکان لە شاری زیقار لە ئەنجامدا هۆزی شەیبان سەرکەوتن ئەمە یێکەم سەرکەوتن بوو لە دژی فارسەکان کە بەماوەیێکی کەم پێش هاتنی پێغمبەر ﷺ روویدا ، بۆیە ئەتوانین بلێین ئەگەر عەرەب لە هەموو مێژوودا بەهێز بووبن ئەوکات بە هێز بوونە هەر لەوکاتەش بنەمالەی قورەیش لە مەککە دەسهەلاتیان هەبووە کە تەنانەت دار الندوی یان هەبووە کە وەك پەرلەمانی ئێستا بوو بۆیە باشترین کاتیان بوو لە سیاسەت کردندا و چونکە لە هەموو مێژوو ئەوکات تۆزێك یێککگرتوو بوون .

بێنە پێش چاوی خۆت ئەگەر پێغمبەر ﷺ لەلایەن خوا نەبوا وە ئەوئیسلامە پشگیری خوای لەگەل نەبوا چۆن ئەو عەرەبانە هەموو مێژووی خۆیان ژێر

دەست ئەبوون و جگە لە شەرێك هیچ شەرێكی دیكەیان نەدەبردەووە چۆن ئەو ئیسلامە توانی ئەم دەولەتە بەهێزە دیكتاتۆرانە كە فـارس و رۆم بـوون بـە ماوەییێكی كەم لەناو ببات وە جگە لەوەش سەرەتا شەری ئەو عەرەبانە بكات كە یێككگرتوو بونە لەنێو خۆیاندا هەرچەندە زولمیشیان ئەكرد بەلام ئەگـەر هەموو مێژوو جارێك هێزیان هەبووبێ ئەوكات هەیان بووە ، ئەگەر ئەم ئیسلامە لەلایەن خوا نەبوا بەم ژمارە كەمە دكتاتۆریەتی قورەیشی عەرەبی شكست پێ بێنێت پاشان زولمی فارس و زولمی رۆمیش كۆتای پێ بێنێـت ، وە بتـوانێ هاوكێشەی حوكمرانی بۆ هەتا هەتا بگۆرێ بە كۆمەلە كەسێكی دەشتەكی بێ دەسهەلات ، ئەم كارە بە چ كەسێك ئەكرێ ؟!.

# بارودۆخی عەرەب پێش هاتنی ئیسلام

## باری ئاینی

لەگەل هاتنی ئیسماعیل علیە سلام بۆ مەککە و دەوروبەری هەمووان پەیرەوی ئاینی ابراهیم بوون و لەسەر ئەو ئاینە بوون وە بانگەشەی یێکتا پەرستیان دەکرد هەتا زەمان رۆیشت و چەندین سەدە پێچوو و پاشان کەسێك بەناوی عمری کوری لوحەی کە لەمەککە چوو بۆ شام بۆ بازرگانی بینی خەلکی شام بتیان دەپەرست و ئەویش وای زانی کە شام شوێنی دابەزینی کتابە ئاسمانیەکانە بۆیە ئەویش هەستی کرد کارێکی باشە کە ئەویش بتەکان ببات بۆ مەککە ئەوەبوو بتێکی هێنا بۆ مەککە و وای بە خەلك راگەیاند کە ئەو بتانە ئەبنە هۆکار بۆ نزیك بوونەوەی خەلکی لە خوا ، واتە لێرە ئەو بە نیەت باشی هێنابووی بۆ خەلکەکە ! ئەمەش لە جاهلی خۆی بوو هەتا دوای وای لێهات مەککەی پیرۆز هەموو مالێك بتی هەبوو و لە هەموو شوێنەکان بت پەرستی بلاو بووە وە یێکتا پەرستی نەما بە دەگمەن نەبێت هەتا هاتنی ئیسلام و ئەم جاهلیەتەی نەهێشت ، لێرە ئەوە جێگای سەرنجە کە ئەوان بە نەزانین تووشی بت پەرستی بوون و خەلك گومرا بوو بەهۆی کەسێکی جاهل کە ئەو لای وابوو زیاتر لەخوا نزیك دەبنەوە .

# له بواری كۆمه‌لایه‌تی

عــه‌ره‌ب و مه‌ككــه‌ی پــیرۆز پــێش هــاتنی ئیســلام لــه بــواری كۆمه‌لایــه‌تی په‌یوه‌ندییێكی به‌هێز هه‌بوو له نێوان كه‌س و كاره‌كان بۆ نموونه كوڕ له‌گه‌ل ئامۆزای یان برازای خوێنی خۆیان ده‌رشت له‌سه‌ر یێكتری خزمایه‌تی هێنده ده‌مارگیر ببوو وه له‌سه‌ر ئافره‌تیش زۆر ده‌مارگیر بوون و جاری وا هه‌بووه به‌هۆی ئافره‌تێك ئه‌بووه شه‌ر له‌نێوان دوو بنه‌ماله له‌گه‌ل ئه‌وه‌ش دا دوا بریار هه‌ر بۆ پیاو بوو و ئه‌بوایه ئافره‌ت بێده‌نگ ببوا و هیچ قیمه‌تێكی نه‌بوو له بریار دان وه كرین و فرۆشتنیش به ئافره‌ت ئه‌كرا و شتێكی ئاسایی بوو وه هه‌روه‌ها ئافره‌ت ببووه كالایێك بۆ به‌تال كردنه‌وه‌ی ئاره‌زوه‌كانیان ته‌نانه‌ت ئــه‌وكات چوار جۆر گواستنه‌وه هه‌بوو له نێوانیان دا كه هه‌ر چواریان دوور لــه بــه‌ها ئه‌خلاقیه‌كان بوو وه كچه‌كانیان زینده به‌چـال ده‌كـرد ، بـه‌لام ئه‌مـه ئــه‌وه ناگه‌ینێت له سه‌رانسه‌ری شاره‌كان وابوو چونكه پێویستیان به كور هه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی به‌رامبه‌ر دوژمن بوه‌ستنه‌وه .

ئه‌وه‌ی لێره بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت بواری كۆمه‌لایه‌تی جگه له ده‌مارگیری هیچ شتێكی دیكه‌یان نه‌بوو له نێوانیان واته به پێی حه‌ق و ناحه‌ق شته‌كان یێكلا نه‌ده‌بوونه‌وه به‌لكوو به پێی خزم خزمێنه بوو له‌ملاش ئافره‌ت له قیمه‌ی بیٚ به‌های خۆی دابوو ته‌نها وه‌ك كالایێك سه‌یر ده‌كرد .

# ئـــابـــوری

لە نێو عەرەب بواری ئابوری و بژێوی ژیانیان تەنها بازگانی بوو وە گەشتیان بۆ شوێنەکان دەکرد و نێو مەککە شوێنی بازرگانی بوو بەتایبەت مانگەکانی حەج کردن ، عەرەب لە بواری پیشەسازی دواکەوتوورین قەوم بوون و هیچ بەرهـەمێکیان نـەبوو کشتوکالیشـیان ئـەکرد بـەلام کـەم وە ئـەم بەرهەمـە پیشەسازی و کشتوکالی بۆیە گرنگیان پیێ نەدەدا چونکە ئەکەوتە بەر هێرشی تالان و دزی و بەزەبری هێز لێیان ئەبرد بۆیـە تـەنها پشـتیان بـە بازرگـانی ئەبەست .

بۆمان دەرئەکەوێت عەرەب لە بواری ئابوری زۆر دواکەوتووبوو تەنها هەندێك سەرکردەیان سوود مەند ئەبوون و زیاتر دەولەمەند ئەبوون و هەژارەکانیش هەژارتر ئەبوون .

# رەوشـــــت

لەرووی رەوشتەوە عەرەب هەنێـدێك سـیفاتی باشـیان تیـا بـوو بـۆ نموونـە خزمەتکردنی میوان و رێز لیێ گرتنیان ئەم سیفەتەی لە نێو ئەوان دا هەبوو لە هیچ قەومێکی دیکە نەبوو تا ئەو رادەیەی ئەگەر درەنگانی شەو میوانیان هاتبا و هیچیان نەبا جگە لە وشترێك ئەوا ئەویان بۆ ئامادە ئەکرد و ئەیان دا پێیان کەچی ژیانیان لەسەر ئەو وشترەش بوو بۆیە زۆر رێزی میوانیان ئەگرت ...

خالێکی دیکە قبول نەکردنی زولم بوو عەرەبی ئـەوکات بـە هـیچ شـێوەیێك نەیاندەهێشت کەس زولمیان لیٚ بکات بە رادەیێك لەسەر شتێکی بچوك ئامادە بوون گیانی خۆیان بکەنە قوربانی ئەگەر هەر چەندیش بێت قوربانیەکە ..

وە خالێکی دیکە عەرەب راستگۆ و خیانەتیان نەدەکرد لە بەرامبەری خۆیان واتە هەموو شتێکی ئەوان راستەوخۆ بوو دوو روو نەبوون لە نێوان ئەواندا ، وە ئەوان گرنگیلێن نەدەدا بە جەنجالی شارسـتانیەت وەکـوو قەومـەکانی دیکـە ژیانێکی سادە ئەژیان .

لەم خالانە چیمان بۆ دەرکەوت ئەگەر سەیری بکەین کێشەی عەرەب دوو شت بوو یێکێکیان جاهل بوونی ئەوان دووەم زال بوونی حەز و ئارەزووی ئەوان بوو بەسەریانەوە ئەگەرنا سیفەتی باشیان هەبوو و ئەم سیفەتە باشانەی ئەوانیش رێگە خۆشکەر بوو پێغمبەرێك لە نێوان ئەوان دا دروست بێتن و جاهلیەتەکەی و ئارەزووی ئەوان سنورێك بۆ دابنێت ، ئەوان وایان ئەزانی بت بپەرست لەخوا نزیك ئەبنەووە ئەمەش لە جـاهلی ئـەوان بـوو بـەلام پێغمبـەر هـات ئەمـەی نەهێشت لە نێوانیان دا وە وتی لا اله الا الله ، بۆیە بەم شێوەیە جاهلیەت نەما

بۆ ئارەزووەکانیان دەبی هیچ سنورێکیان نەبوو لە تێرکردنی ئارەزووەکانیان ژیانیان وەك ئاژەل بوو وە ژن هێنان سنوری نەبوو بۆیە پێغمبەر هات سنوری بۆ ئارەزووەکانیان دانا وە پێی وت نابێت وەك ئاژەل بژین بۆیە ئەم دوو کێشە سەرەکیەی ئەوانی چارەسەر کرد ، بۆیە لەو سەردەمە هاتنی پێغمبەر لە نێوان

عەرەب سەد لەسەد پێویست بوو و کات وشوێنی گونجاو بوو ئەمەش سەد لەسەد هیچ گومانێك ناهێڵێت کە بەراستی محمـد ﷺ پێغمبەری خوایە .

## چەند روداوێك پێش لەدایك بوونی پێغمبەرﷺ

نوێکردنەوەی بیری (زَمْزَم) لە لایەن (عَبْدُ الْمُطَّلِب):

(عَبْدُ الْمُطّلِب) ناوی (شَيْبَة)یە، پێی دەگوترا: (شَيْبَةُ الْحَمْد).

زانایان فەرموویانە: بنەماڵەی (جُرْهُم) لە (مَكَّة) دەستیان بە خراپەکاری کرد و بیری (زَمْزَم)شیان پڕ کردەوەو ئاوەکەی ون بوو، ناچار دانیشتووانی (مَكَّة) چەند بیرێکی تریان هەڵکەندن و لەو بیرانە ئاویان دەخواردەوە، تا بە دەستی (عَبْدُ الْمُطّلِب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ بیری (زَمْزَم) هەڵکەندراوە.

ئیمام (عَلِي رضي الله عنه) فەرموویەتی: جارێك (عَبْدُ الْمُطّلِب) لە ناو (حِجْر إِسْماعِيل)داﷺ خەوتبوو، لە خەوندا پێیان گوت: ﴿(زَمْزَم) هەڵکەنەو ئاوەکەی نابڕێو حاجیەکانی پێ ئاو بدە، شوێنەکەی لە نێوان شیاکو خوێنەکەیە لەو شوێنەی قەلەکەی قاچ سپی دندوکی لێدەدا لە لای شارە مێرووەکە﴾.

جا (عَبْدُ الْمُطّلِب) بەو ڕێنموونیيە شوێنی (زَمْزَم)ی دۆزیەوەو دەستی بە هەڵکەندن کرد بەخۆیو (الْحارِث)ی کوڕی –کە جگە لە (الْحارِث) هیچ کوڕی تری نەبو– جا کە ئاسەواری بیرەکە دەرکەوت، (عَبْدُ الْمُطّلِب) گوتی: (اَللّهُ أكْبَر).

ئیتر کە (قُرَيْشِي)یەکان زانییان (عَبْدُ الْمُطّلِب) گەیشتە مەبەستی خۆی، لە دژی کۆ بونەوەو گوتیان: هۆ (عَبْدُ الْمُطّلِب) ئەم بیرەی (زَمْزَم)، بیری (إِسْماعِيل)ی باوکمانە، کەوابوو: هەمووما‌ن لەم کارەدا هاوبەشین –نەك تۆ بە تەنها– جا (عَبْدُ الْمُطّلِب) گوتی: من وا ناکەم ئەم کارە تایبەتە بە خۆم، ئێوە هیچ مافێکتان لەم کارەدا نیە.

جا (قُرَيْشي)يەكان گوتيان: وازت لێ ناهێنين تەنها بە دادگا نەبێ... ئيتر ڕێك كەوتن: بچنە لای (كاهِنَة)ی (بَنِی سَعْد) لە وڵاتی (شام).
جا بە تێكڕايی ڕۆيشتن‌و لە ڕێگەدا لە بيابانێكدا ئاويان لێ بڕا و خەريك بوو بە تێنووەتی بمرن، ناچار ڕێك كەوتن هەر كەسەيان بۆ خۆی قۆرتێك هەڵكەنێ، بۆ ئەوەی هەر كاتێك مرد، ئەوەی زيندووە بيخاتە ناو قۆرتەكەی‌و خۆڵەكەی بە سەردا بكاتەوە، جا قۆرتەكەيان هەڵكەنـد و دانيشتن چاوەڕوانی مردنيان دەكرد.
ئينجا (عَبْدُ الْمُطَّلِب) گوتی: مانەوەمان لێرە بەم شێوەيەو تەسليمبوونمان بۆ مـردن بـەم جۆرە، تەمبەڵی‌يە، كەوابوو: با بە تێنووەتی بڕۆين بەڵكی خوای گەورە ئاومان بداتێ. ئينجا هەڵسان ڕۆيشتن، جا كە (عَبْدُ الْمُطَّلِب) وشترەكەی خۆی هەڵساند، يەكسەر لـە بـن سمـی وشترەكەی سەرچاوەيەكی ئاو هەڵقوڵا، (عَبْدُ الْمُطَّلِب)و ئـەوان گوتيـان: (اَللّٰهُ أَكْبَـر). جـا دابەزين‌و ئاويان خواردەوەو كوندەيان پڕ ئاو كردن، ئينجا داواكارەكان گوتيان: وَاللّٰهِ خوای گەورە بڕياری دادگايەكەی بۆ تۆ دا، هيچی‌تر لەبارەی (زَمْزَم) كێشەت لەگەڵ ناكەين، ئەو خوايەی لەم بيابانە ئاوی دايێ، هەر ئەو خوايەش (زَمْزَم)ی داويێ. ئينجا هەر لەم بيابانەوە گەڕانەوە بۆ (مَكَّة)و وازيان لە بيری (زَمْزَم) هێنا بۆ (عَبْدُ الْمُطَّلِب).
ئيمام (ابن إسحاق) فەرموويەتی: كە (قُرَيْشی)يەكان لە سەر بيری (زَمْزَم) كێشەيان لەگەڵ (عَبْدُ الْمُطَّلِب) كرد، گوتيان: تۆ تەنها يەك كوڕت هەيەو دەوڵەمەنديش نی، چۆن زماندرێژيمان دەكەيە سەر= ململانەمان لەگەڵ دەكەی؟ جا (عَبْدُ الْمُطَّلِب) گوتی: بۆ خوا لە سەرم نەزر بێ ئەگەر خوا دە كوڕم بداتێ، يەكێكيان لە لای (كَعْبَة) سەر ببڕم. ئينجا كە (عَبْدُ الْمُطَّلِب) دە كوڕی بە تەواوی بون-(**الحارِث، الزُّبَيْر، حَجْل، ضِرار، اَلْمُقوَّم، أَبُو لَهَب، العَبّاس، حَمْزَة، أَبُو طالِب، عبد الله**)- هەمووياني كۆ كردنەوەو هەواڵی نەزرەكەی پێ گوتن؟ ئەوانيش گوێڕايەڵی باوكيان بون، جا (عَبْدُ الْمُطَّلِب) تيروپشكی لە نێوان كوڕەكانی‌دا كرد و ناوی (عبد الله) بۆ سەربڕين دەرچوو، بەڵام (قُرَيْشی)يەكان ڕێگايان نەدا و گوتيان: ئەگەر تۆ (عبد الله) سەر ببڕی، ئەو سەربڕينە لە ناوماندا دەبێتە عادەت.
ئيتر بڕياريان دا: بچنە لای (كاهِنَة)ی (حِجاز) لە (مَدِينَة)، جا كە هاتنە (مَدِينَة)، لەو كات (كاهِنَة)كە لە (خَيْبَـر) بوو، جا چونە لای‌و وەزعەكەيان بۆ باس كرد، (كاهِنَـة)كـە گـوتی: خوێنی يەك پياو لە لای ئێوە چەندە؟ گوتيان: دە وشترە. جا (كاهِنَة)كە گوتی: بڕۆنەوە شارەكەی خۆتان، تيروپشك لە نێوان (عبد الله)و دە وشتردا بكەن: ئەگەر تيرەكە لە دژی (عبد

الله) دەرچوو، دیسان تیروپشك لە نێوان (عبد الله)و دە وشتریتردا بکەن...هەر بەم جۆرە تا تیرەکە-بۆ (عبد الله)-لە دژی وشترەکان دەردەچێ.
جا ئەوان گەڕانەوەو بەو جۆرەی ڕابردوو تیروپشکیان لە نێوان (عبدالله)و دە وشتردا دەکرد تا ژمارەی وشترەکان گەیشتە سەد وشتر، ئینجا (قُرَیْشی)یەکان گوتیان: هۆ (عَبْدُالْمُطَّلِب) خوا ڕازی بوو.
جا (عَبْدُ الْمُطَّلِب) سەد وشترەکەی لەجیاتی (عبد الله) سەر بڕین‌و کردنیە قوربانی، ئادەمیزاد و دڕندەو باڵندە لە گۆشتەکەیان دەخوارد.
ئیمامی (الزُّهْري) فەرموویەتی: (عَبْدُ الْمُطّلِب) یەکەم کەس بوو: خوێنی یەك پیاوی کردە سەد وشتر، پێغەمبەریشﷺ لە ئیسلامدا ئەم خوێنەی جێگیر کرد: بەو شێوەی لە کتێبەکانی شەریعەتی ئیسلامدا ڕوون کراوەتەوە. (البدایه والنهایه) ب(١) ل(٥٨٦-٥٩٠) و(السیره الحلبیه) ب(١) ل(٤٨-٥٥).

ڕوداوێکی دیکەش پێش لەدایك بوونی پێغمبەر ﷺ بە ماوەییێکی کەم کە ٥٠ هەتا ٥٥ ڕۆژ پێش لەدایك بوونی ڕوداوی فیل کە ئەبرەهەی مەسیحی هێرشێکی مەزنی هێنا بۆ سەر مەککە بۆ ڕوخاندنی کەعبەی پیرۆز کە ژمارەی سەربازەکانی شەست هەزار کەس بوون وە پێشەوەی سوپاکەی ٩ یان ١٢ فیلْ بوون کە ئەبرەهەی لە یەمەن ئەژیا ، بەلام خوای گەورە نەیهێشت کەعبەی پێرۆز بروخێنن و جۆرە باڵندەیێکی بۆ نارد کە توانیان سوپاکەی ئەبرەهە شکەست پێ بێنن و ناچاری بکەن بگەرێنەوە پاشان ئەبرەهە کە گەرایەوە توش نەخۆشییێك بوو و کۆچی دوای کرد .

لەم روداوە دوو خالی گرنگ روون ئەبێتەوە
خالی یێکەم زۆر کەس ئەلێت کێ ئەلێت ئەم روداووە راستە و هێرشی ئەبرەهە بەهۆی بالندە لەناو چووە چ عەقلێك قبول ئەکات؟؟؟
منیش دەلێم خۆ نێوان هاتنی پێغمبەر و ئەو روداووە پێنجە رۆژ بوو پاشان پێغمبەری ﷺ خوا لە چل سالی وەحی بۆ هات واتە نێوان قورئان و ئەو روداوە چل سالە ، کە قورئان بە ئاشکرا باسی ئەکاتن چۆن چۆنی بووە ، باشە ابو جهل و دوژمنانی دیکەی محمد ﷺنەیان ئەتوانی تۆزێك سەیری مێژووی خۆیان بکەن یان بپرسن ئایا ئەوە راستە یان نە تەنانەت خۆشیان بەتەمەن تر بوون لە پێغمبەر باشە کەسێك بۆ نەی ئەوت ئەی محمد ﷺتۆ راست ناکەی شتی وا رووی نەداوە و ئەوەی تۆ ئەیلێی خورافیاتە و هیچی دیکە نیە خۆ ئێمە ئەو سەردەمە دەژییاین یان باوکمان ئەژیا بۆ باسی نەدەکرد ؟! نەخێر بەدلنیایەوە روداوەکە راست و حەقیقی بوو بە شاهێدی هەموو دوژمنەکانی .

با بێینە سەر خالی دووەم کە لە خالی یێکەم دلنیابووینەوە ئەم روداوە راست و دروستە وە رووی داوە با سەرنجێك بخەینە سەر ئەوەی بۆچی خوای گەورە نەی هێشت ئەبرەهەی مەسیحی مالێك وێران بکات کە موشریکی لێ بوون ؟! کەچی وەك دەزانین پێشتر قودس دوو جار وێران کراوە جارێکیان موشریکەکان هێرشیان کردە سەر قودس لەکاتێك موسلمانەکان لێی بوون لە سەردەمی ( بوختە نەسر ) بوو لە سالی ٥٨٧ پێش زاین بوو وە روداوی دووەم کە رۆمەکان هێنایان بۆ سەر قۆدس لە سالی ٧٠ زایینی بوو ، هەردوو جارەکە قودس وێران بوو بەلام دەبینی خوای گەورە نەیهێشت مەککە لەناو بچێت

کەچی موشریکەکان لەوێ حوکمیان ئەکرد ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی خوای گەورە ئەم شوێنە ئامادە ئەکات بۆ هاتنی کەسێك بۆیە نابێت داگیر بکرێت ، ئەم هەموو ڕوداوە ڕێگە خۆشکەرن بۆ لەدایك بوونی کەسێك کە جیهان رزگار بکات لەم هەموو زولم و ناخۆشیەی کە تووش بووە .

## لە دایك بوونی پێغمبەر ﷺ

لە ڕۆژ دووشەممە (٩) ڕەبیعی یێکەمی سالی ( فیل ) سالی ( ٥٧١ ) پێغمبەر ﷺ لەدایك بوو ئەوکات باوکی کۆچی دوای کردبوو پێش دوو مانگ بۆیە کە لەدایك بوو باپیری عبدالمطلیب بردی بۆ لای کەعبەی پیرۆز و سوپاسی خوای گەورەی کرد بەپێی گێرانەوە هەر لەگەل لەدایك بوونی هەندێك روداوی سەیر رووی داوە تەنانەت دایکی ئەلێت نورێك لە داوێنم دەرچووە و کۆشکەکەی شامی روناك کردووتەوە وە چەند روداوێکی دیکەش رووی داوە ، بەلام با سەرنجێك بدەینە سەر ئەوەی کاتێك باپیری بردی بۆ لای کەعبەی پیرۆز ناوی لیّ نا و ناوێکی نامۆی هەلبژارد کە پێشتر لەناو قورەیش بە تایبەتی و ناو عەرەب بە گشتی ئەو ناوە بوونی نەبوو کە محمد .

ئەمەش جێگای سەرنج و تێرامانێکی زۆرە بۆچی ئەو ناوەی هەلبژارد خۆ لەناو عەرەب ئەم ناوە نەبوو دەبێت شتێك لە پشت ئەم رووداوە هەبێتن ، ئەگەر سەیری کتابە ئاسمانیەکانی پێش ئێستا بکەین کە لەم سەردەمەش دا هەیە کە هی مەسیحیەکان و یەهودیەکان بکەین بە ئاشکرا موژدەی هاتنی کەسێك

ئەدەن و ناوی محمدی تیایە بۆ نموونە کە سەیری تەورات بکەین لە بەشی سرودی سرودەکان اسحاحی ٥ ئایەتی ١٦ بە ئاشکرا ناوی محمدی ﷺ تیایە نەسی ئایەتەکەش بە زمانی عیبریە کە باس لە کەسێك ئەکات کە خۆشەویستە لا خەلکی ئەو م لە کۆتایش هاتووە بۆ ڕێزگرتنە لەو کەسە .

وە هەروەها لە کتێبی پیرۆز _ سفری ئیشتیراع ١٨ : ١٨ باسی هاتنی کەسێك دەکات کە بە هەموو پێوەرەکان محمد ﷺ ، بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەم باسە بگەرێوە سەر کتێبە نایابەکەی شێخ احمد دیدات بەناوی بژاردەی نێوان ئیسلام و مەسیحەیەت .

لێرە ئەپرسین نە جولەکە نە مەسیحی ئەوکات لە کەعبە نەبوون هەتا بە باپیری بلێن ئەو ناوە دابنێ چونکە شتێکی وا لە کتێبەکەمان دا هەیە . بونی ناوی پێغمبەر لە کتێبەکانی دیکە هیچ شك و گومانێك ناهێلێت بۆ راستی پێغمبەر ﷺ وە هەلبژاردنی ئەو ناوە نامۆیە لەلایەن باپیری ئەوەمان پیشان ئەدات کە ئەمە جیاواز ئەبێت لە کەسەکانی دیکە وەك چۆن جیاوازە لە ناوەکەی .

کاتێك تەمەنی پێغمبەر نزیك ئەبێت لە دوو سالی دەچێت بۆ گوند ، ئەوکات نەریتی عەرەب وابوو کە سالانە ئافرەتانی گوند ئەهاتن منالیان ئەبرد بۆ ئەوەی منالەکان فێری زمانێکی پاراو بن لەوێ وە دووڕ بن لە نەخۆشیەکانی شار وە لە بەرامبەر ئەم کارە ئەو ئافرەتانەش هەندێك پارەیان دەست ئەکەوت ، بەلام پێغمبەر بێ باوك بوو بۆیە هیچ ئافرەت ئامادە نەبوو هەلیگرێت دوای

ئافرەتێك بەناوی حەلیمە چونکە هیچ منالێك نەبوو ببیبات لەگەل خۆی بۆیە ناچار بوو محمد ﷺببات لەگەل خۆی .

حەلیمە خـۆی ئەگێرێتـەووە کـە زۆر روداوی سـەیر رووی داوە وە  دەلێـت بەرەکەتێکی زۆر رژاوە بەسەرمان تەنانەت ئەو ئافرەتانەی لەگەل من بوون کاتێك لە مەککە ئەگەراینەوە ئەیان وت ئەمە هەمان ئەو گوێدرێژە نیە کە کاتێ هاتین بۆ مەککە لە کۆتای بوو و نەدەرۆیشت ئیستا لە پێشەنگە !! وە پێشتر شیری من بەشی کورەکەی منیش نەدەکرد بەلام دوای کە محمد ﷺم هێنـا بەشیێ هەردووکیان ئەکرد و زیادیش ئەبوو  وە شوێنەکەمان کە پێی ئـەلێن بەنی سەعد پێشتر هیچ رۆژێك مێگەلەکەمان تێر نەدەبوون بـەلام دوای وای لێهات خەلکی ئەیان وت بۆچی مێگەلی ئەوان هێندە شیری تیایە ئەبێ هۆکار چی بێتن ؟؟ !

حەلیمە ئەلێت وام لێهات بە مێردەکەم دەوت ئەم کورە بۆ ئێمە بوو بەرەکەت و رەحمەتی بۆ ئێمە هێنا و زۆر جیاوازە لەگەل منالەکانی دیکە .

ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین حەلیمە خۆی ئەم رووداوە ئەگێرێتەوە و خۆی بەسەرهاتەکە ئەلێت کە هـەر لـە منالیـەوە ئـەم منالـە بـووە بەرەکـەت بـۆ دەوروبەری خۆی بۆیە پێشبینی ئەکرێ ئەم منالـە جیـاواز بێـت لـە هـەموو منالەکانی دیکە ، ئەگەر ئەم رووداوە راست نەبوا خۆ ماوەکەی هێنـدە زۆر نەبوو کاتێك حەلیمە ئەم شتەی ئەوت بۆچـی روژێـك ئافرەتێـك نـەی دەوت ئەوەی حەلیمە ئەی لێت راست نیە و ئێمە لەگەل ئەو بووین شـتی وا رووی

نەداوە یان حەلیمە چ مەجبورە ئەم شتانە بلێت و شتێك بلێت كە راست نەبێت و تەنانەت چ سودی بۆ ئەو ئەبوو كە ئەم شتانە بلێت كە راست نیە وەك پێشتر باسمان كرد ئەوكات عەرەب هەرگیز حەزی لە درۆ و خیانەت نەبووە .

روداوێكی دیكە هەر لەو سەردەمە كاتێك ماوەكەی تەواو بوو حەلیمە زۆر داوای لە ئامینەی دایكی پێمغبەر ﷺ كر كە رێگەی پێبدات جارێكی دیكە لەگەل خۆی بباتەوە ، ئامینەش رازی بوو كاتێك حەلیمە لەگەل خۆی بردەوە رۆژێك محمد ﷺلەگەل منالەكانی دیكە یاری دەكرد خێرا كوری راستەقینەی حەلیمە هات بە حەلیمەی وت دایە دایە دوو كەس هاتن و سینگی محمد ﷺ یان شەق كردوو و كوشتیان ! كە ئەم رووداوە مەلائیكەت هاتن و بەشی شەیتانیان لە سینگی پێغمبەر ﷺ هێنا دەرەووە ، كە ئەم نیشانەیە لەسەر سینگی دیار بوو هەتا كۆچی دوای كرد .

لێرە ئەپرسین منالێكی چوار سالان چۆن ئەتوانیّ درۆ بۆ دایكی بكات و بلێت دوو كەس هاتن و سینگی محمدیان شەق كرد ! ! ! ئەمە ناچێتە بە عەقلی هیچ كەسێك درۆی وا بۆ دایكی بكات و راستی رووداوەكە دەسەلێمنێت كە راست و دروست بووە و بەشی شەیتانیان لیّ دەركردووە وە دوای ئەم روداوە حەلیمە زۆر ترساوە و ناچار بوو محمد ﷺ بباتەوە بۆ لای دایكی نەوەك شتێكی لیّ بێت لەلای ئەو وە دلنیابووە ئەم منالە منالێكی ئاسایی نیە وەك منالەكانی دیكە ئەوكات تەمەنی پێغمەر لە نێوان چوار بۆ پێنج سالان بوو.

نی

# دوای گەڕانەوەی بۆ مەککە

دوای ئەوەی حەلیمە پێغمبەر ﷺ ی هێناوە بۆ لای دایکی زۆری پێ نەچوو ئامینەی دایکی پێغمبەر بریاری دا سەرەدانی گۆری عبداللەی هاوسەری بکات کە لە ( یەثریب ) بوو زۆ دوریش بوو ل مەککە کاتێك گەڕانەوە لەو سەفەرە وە پێغمبەر ﷺ یشی لەگەل بوو ئامینە تووشی نەخۆشی بوو و لە نێوان مەککە و مەدینە کۆچی دوای کرد ئەوکات پێغمبەر تەمەنی شەش سالان بوو ، پاشان لەلای باپیری بوو بۆ ماوەی دوو سال دواتر ئەویش کۆچی دوای کرد ئەوکات تەمەنی پێغمبەر ﷺ تەمەنی هەشت سالان بوو پاشان لای مامی بوو کە ابو طالب بوو .

لێرە دەبینین پێغمبەری خوا چی بەسەر هات پێش لە دایك بوونی باوکی کوچی دوای کرد تەمەنی شەش سالان دایکی کۆچی دوای کرد تەمەنی هەشت سالان باپیری کۆچی دوای کرد ! لەم بارودۆخە سەختەی عەرەب تێیدایە لەگەل ئەوەش دا ئەم منالە هەشت سالانە هیچ کەسێکی نەماوە جێگای بەزەییە وەلای مامی بێت ، ئەمەش بەدلنیایەوە قەدەری خوای گەورەیە بۆ ئەوەی لە دوا رۆژ هیچ کەسێك نەلێت کە ئەم کورە دایك و باوکی زانا بووە و ئەوان فێریان کردووە بۆیە ئەو وا زیرەکە بۆیە بەم روداوانە هیچ گومانێك نامێنێت کە رۆژێك لە رۆژان کەسانێك شتیان فێری محمد ﷺ نەکردووە هەتا زیرەك و لێ هاتوو بێت هەموو تەمەنی لای مامی بوو کە ابو طالب بوو کەچی ابو طالب باوەری پێ نەهێناوە ! بۆیە ئەگەر بلێین ابو طالب فێری کردووە ئەوا ابو طالب لە شوێنی محمد ﷺ کەسێکی دیکەی فێر دەکرد لە کورەکانی یاخود

هەر هیچ نەبوایە خۆی باوەری پیّ دەهێنا بۆیە لە هیچ شوێنێکی مێژوو نابینی کەسێك شت فێری کەسێك بکات و فێری کورەکانی نەکات یانیش خۆی باوەری پیّ نەهێنیّ بۆیە هەر لێرە نیشانەکان دەردەکەوێت کە خوای گەورە ئەمەی هەلبژاردووە وە ئەبێت بیّ باوك و بیّ دایك و بیّ باپیر بێت بـۆ ئـەوەی هـیچ گومانێك نەمێنێت لەسەری و هەموو تەمەنی بچێت شوانی بکات لەم سەحرایە لەگەل کورە مامەکانی بۆ ئەوەی بژێوی مالەکەی ابو طالب دابین بکەن .

کاتێك پێغمبەر ﷺ تەمەنی گەیشتە دوازدە سالی ابوطالب لەگەل خۆی برد بۆ گەشتی بازرگانی بۆ شام لە رێگادا لە بوسرە کە سەربە شامە راهیبێك هاتە لایان وتی ئەم کورە نەبەن بۆ شام چونکە جولەکە ئەیناسنەوە و ئەیکوژن وە داوای کرد خێرا بیگەرێنەوە مەککە ابوطالب بە راهیبەکەی وت بۆچـی وتـی چونکە ئەمە سەرداری جیهانیانـە ، ابـو طـالیبیش وتـی تـۆ چـۆن ئـەزانی ، بوحەیرای راهبیش پێی وت من بینیم دار و بەرد نەما کرنوش بۆ ئەمە نەبەن دار و بەردیش تەنها بۆ پێغمبەران کرنوش ئەبەن وە مۆرێکیشی لەسەر دەفەی شانیەتی شێوەی سێوە وە راهیبەکە وتی ئەمە لە کتێبەکەی ئێمە باس کراوە ، بۆیە ابو طالبي مامی محمد ﷺو چەند گەنجێکی دیکەی ناردەووە بۆ مەککە .

لەم روداوە بۆمان دەردەکەوێت کە خاوەن ئاینەکانی دیکـەش دەیـان زانـی کەسێکی دیکە دێت و جیهان لە چاوەروانی کەسێکی دیکەیە هەر بۆیە ئـەم راهیبە خێرا توانی بیناسێتەوە وە وتی ئەمە لە کتێبەکانی ئێمە باس کراووە وە وتی جولەکەش ئەیناسنەوە ، ئەگەر محمد ﷺ پێغمبەر نەبوا لەم تەمەنە

منالەی کە دوازدە سال بوو بۆچی راهیبەکە دەیناسێتەوە وە داوا لە مـامی دەکات نەبات بۆ شام ! وە ئەگەر ابو طالب دلنیا نەبوا لە راهیبەکە بۆچـی گەراندیەوە وە لەگەل خۆی نەبرد ؟!

ئەگەر بلێن روداوەکە راست نیە کاتێك محمد ﷺ پێغمبەرایەتی راگەیاند بۆچی کەسێك نەبوو بە محمد بلێت تۆ نەگەرایەوە بۆ مەککە و چووی بۆ شـام بـۆ بازرگانی تۆ لەوێ شارەزایت پەیدا کردووە وە بۆچی پێیـان نـەدەوت ئێمـە بیرمان دێت تۆ لەگەل ابو طالب چووی و لەگەل ئەویش گەرایەوە بۆیە ئەم شتە ئەسل و ئەساسی نیە یان بۆچی کەسانێك لە شام نەیان دەوت فلان و فلان لە گەشتەکە لەگەل ابو طالب بوون ؟؟ نەخێر چونکە دلنیابوون روداوەکە راست بوو و پێغمبەر ﷺلە رێگای گەرایەوە کاتێك راهیبەکە پێی راگەیانـد و ابـو طالب گەراندیەوە بۆیە روداوەکە دلنیاین راست و دروستە و هیچ گومانێکی تیانیە ، کە دلنیاشین روداوەکە راستە بۆمان دلنیا دەبێتەوە کـە نیشـانەی پێغمبەرایەتی هەر لەسەرتا لەلای هەبوون و خاوەن دینە ئاسمانەکانی دیکەش ئاشکرا ئەیان زانی وەك چوو پێشتر باسمان کرد کەناوی لە تەورات هاتووە لە سرودی سرودەکان اصحاحی ٥ ئایەتی ١٦ باسکراوە .

# تەمەنی گە نجی پێغمبەر ﷺ و پێش چل سالی

پێغمبەر ﷺ لە تەمەنی پانزە سالی بەژداری شەری فوجاری کرد و تیری ئامادە ئەکرد لە نێوان قورەیش و خێلی کەنانە وە زۆربەی ریوایەتەکان دەلێن لە تەمەنی گەنجی شوانی کردووە تا تەمەنی ٢٥ سالی پاشان بازرگانی بۆ خاتوو خەدیجە کردووە وە چوە بۆ شام پاش گەرانەوەی سودی زۆری کردووە لە بازرگانیەکەی وە خاتوو خەدیجە غولامێکیشی لەگەلی ناردبوو پاش گەرانەوە غولامەکە باسی ئەوە دەکات کە محمد ﷺ چۆن بوە و چۆن هەلسوکەوتی کردبووە بۆیە خاتوو خەدیجە حەز دەکات پێغمبەر ﷺ بیخوازێ وە پاشان خاتوو خەدیجە بە رێگای ئافرەتێکی دیکە داوای لێ کردووە و ئەویش رازی دەبێت .

ئەبینین پێغمبەر ﷺ هەر لە گەنجیەتی دا جیاواز بووە لە گەنجەکانی دیکە بە هەلسوکەوت و ئەمانەت و هەموو شتێکی دیکە سەرنجی خەلکی بۆ لای خۆ راکێشاوە ئەگەرنا خەدیجاییێکی دەولەمەند چۆن داوا لە کەسێکی هەژار ئەکات بێت بیخوازێت ؟؟

پێغمبەر ﷺ حەوت منالی هەبووە وجگە لە ابراهیم ئەوانی دیکە هەمووی لە خاتوو خەدیجە بووە ، وە ئەوەی جێگای تێرامانا هەرسێ کورەکانی لە تەمەنی منالی وەفات ئەکەن ! وە هەرچوار کچەکەی گەورە دەبن و تا سەردەمی ئیسلام و موسلمان ئەبن تەنانەت کۆچ ئەکەن بۆ مەدینە بەلام جگە لە فاگیمە هەرسێ کچەکەش پێش پێغمبەری خوا وەفات ئەکەن ، بەلام لێرە

ئەپرسین چ حیكمەتێك تیایە هەرسێ كورەكانی وەفات ئەكەن ؟ وەك ئەزانین حسن و حوسێن كوری كچی پێغمبەر بوون وە تا ئێستاش كەسانێك هەن ئیدیعای ئەوە دەكەن ئەوان پیرۆزن چونكە ئەگەرێنەوە سەر بنەماڵەی ئەوان خۆ تەنانەت لە حوسیەكانی یەمەن و تەنانەت كوردی واش هەیە ئیدیعای ئەوە ئەكات ، بۆیە بیركەینەوە ئەگەر كورەكانی گەورە بان و ئەوانیش منالیان هەبوا ئێستا چەند خەلكی ئەو ئیدیعایەیان ئەكرد و خەلكی نەزان وجاهلیش بە پیرۆزیان دادەنان هەرچەندە ئەم شتە لە ئیسلام دانیە ، چونكە نوح پێغمبەر بۆ كورەكەی هیچی پێ ناكرێ .

لە تەمەنی سی وپێنج سالی كاتێك بینای كەعبەیان نۆژەن كردەوە خەریك بوو جەنگێكی خوێناوی رووبدات لە نێوان خێلەكان بەلا كەسێك وتی دەبێ كەسێك بكەین بە ناوبژیوان وتیان هەر كەسێ هاتە ژوورەوە ئەوا ئەو دەكەین بە ناوبژیوان سەیری دەرگایان ئەكرد قەدەری خوا پێغمبەری خوا ﷺ یێكەم كەس بوو هاتە ژورەوە و هەموان وتیان بەلێ رازین پیاوە دەست پاكەكە بكەین بە ناوبژیوان بۆیە پێغمبەر ﷺ یان تێگەیاند لە مەسەلەكە ئەویش وتی پارچە قوماشێك بێنن و هەر كەسێك لە خێلێك لایێكی پارچە قوماشەكە بگرێ هەتا بەردە رەشەكە لە شوێنی خوێ دانێین ، حیكمەتی و داناي پێغمبەر ﷺ لێرەش چارەسەری كێشەیێكی گەورەی كرد .

ئەم پێغمبەرە ﷺ لە هەموو تەمەنی رۆژێك لە رۆژان مەشروبی نەخواردووتەوە كەچی گەنجانی دەوروبەری هەمووان دەیان خوارەدەوە و شتێكی ئاسایی بوو ، بۆچی ئەویش رۆژێك لە رۆژان نەیدەخوارەدەوە ئەگەر ئەمە كەسێكی جیاواز

نەبێت ، پێغمبەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بەدرەوشتییێكی لەگەل ئافرەتێك نەكردووە لە هەموو تەمەنیدا خۆ ئاسانترین شت لەو سەردەمە كردنی كاری بەدرەوشتی بوو ، ئەی بۆ ئەو نەیكرد ؟؟

ئەی بۆ پێغمبەر ﷺ ڕۆژێك لە ڕۆژان سوێندی بە لات و عوزە نەخوارد ؟ كە ئەوكات خوای قورەیش بوو و هەمووان سوێندیان پێ دەخوێند ئەی بۆچی ئەو واینەدەكر لە هەموو تەمەنی ، یان بۆچی ڕۆژێك لە ڕۆژان بە هەلەش سوجدەی بۆ ئەو بتانە نەبردووە یان لێی بپارێتەوە تەنانەت لە تەمەنی منالی ؟؟ تەنانەت خۆی دەگێرێتەوە دەلێ ڕۆژێك حەزم كرد بچم بۆ شاییێك و منیش خۆشی بكەم وەكوو گەنجەكانی ئەوكات بەلام دەلێ لە ڕێگاتادا خەوم لێ كەوت و تا بە گەرمای ڕۆژ خەبەرم بووە و ڕۆژی دواتریش هەروا رووی دا وە دەلێت تەنها ئەو دوو جارە خۆشی دونیام لابوو بەلام خوا پاراستمی و جارێكی دیكە ئەم خۆشیانەم بەدل دا نەدەهات ، ئەم بەلگانە ئەسەلمێنێت ئەم گەنجە كارێكی قورسی لەپێشە و جیهان چاورەێی ئەوە وە خوای گەورە ئامادەی ئەكات بە باشترین شێوە .

ئەگەر بلێن ئەم شتانە وانیە و كێ نالێ ئەم كارانەی كردووە من هیچ نالێم تەنها ئەلێم بۆچی ڕۆژێك لە ڕۆژان كەسێك نەدەهات لە كاتی پێغمبەرایەتی بە محمدﷺ بلێ ئەوە چیە تۆ دەیلێی ئەی فلان ڕۆژ و فلانە شوێن تۆش لەگەل ئێمە نەبووی و مەشروبت نەدەخوارەدەوە یان فلان ئیشت نەدەكرد ؟؟ بۆچی هیچ كەس ئەمەی نەوتووە ، چونكە هەرگیز و هەرگیز پێغمبەری خوا ﷺئەم كارانەی نەكردووە و هەموو مێژوو شاهیدە تەنانەت دوژمنەكانیشی لە پێش

دۆستەکانی شاهیدی پاکی محمد ﷺکـە ئیسـتاش ئـەبینین لـە نێـو هـەموو کەسایەتیە جیهانیەکان ناوی ئەوە .

# هاتنی وەحی لە تەمەنی چل سالی پێغمبەرﷺ

لە سالی ٦١٠ زاینی کە ئەوکات پێغمبەری خوا ﷺتەمەنی چل سال بوو لـە ئەشکەوتی حەرا وەحی بۆ هات و پێی وت اقرا وتی من نەخوێندەوارم سێ جار دوبارەی کردووە پاشان پێغمبەری خوا زۆر ترسـا بـە خێـرا گـەراوە وە بـە خێزانی وت دامپۆشە دامپۆشە ئەویش داپۆشی و پێغمبەر ﷺوتی دەترسم شتێکم بەسەر بێت ، خاتوو خەدیجەش وتی نەخێر تۆ کەسێکی زۆر باش و راستگۆی هەرگیز خوا لەناوت نابات .

پاشان خەدیجە لەگەل خۆی بردی بۆ مالی وەرەقە کە لەسەردەمی جـاهلی وەرەقە ببوو بە مەسیحی وە وەرەقەی کوری نەوفەل ئامۆزای خەدیجا بوو پیاوێکی کوێر بوو و بەتەمەن بوو ، پێغمبەر ﷺ بەسەرهاتەکەی بۆ گێراوە وتی ئەوەی بۆ موسا علیە سلام هاتووە بۆ تۆش هاتوە خۆزگە لە ژیان مابام کاتێك ئەم بینی ملەتەکەت لە شار ئەتکەنە دەرەووە پێغمبەر ﷺ یش لای سەیر بوو وتی قەومەکەم ئەمکەنە دەرەوە ! ئەوەی روون و ئاشکرایە پاشان وەرەقە وەفاتی کرد و پاش چەند سالێك پێغمبەر ﷺیان دەرەکرد و قسەکەی راست دەرچوو .

دەبێت بیرکەینەوە کەسێك لە چل سالی تەمەنی خراپە و خیانەتێکی نەکردبێ یان رۆژێك لە رۆژان درۆیێکی بۆ دوژمنەکانیشی نەکردبێ و هەموو گەنجیەتی رۆژێك لە رۆژان راینەبواردبێ وەکوو گەنجەکانی دیکە یان مەی نەخواردبێتەوە یان کاری بەدرەوشتی نـەکردبێ وە دوژمـن و دۆسـتەکان شـایەدی پـاکی و

راستگۆی بدەن لەم هەموو تەمەنە وە کەسێك بگاتە چل سالی ئینجا بێت بوختانێکی گەورە بکات و بلێت من پێغمبەری خوام و ئەم خیانەتە لە ملەتەکەی بکات بە هیچ جۆرێك لۆژیکی نیە ، چونکە ئەگەر بیریش بکەینەوە پێغمبەر ﷺ چ سودێکی دنیایی ئەبینێ ئەگەر خیانەتێکی وا گەورە بکات تەنانەت چ مەجبور بوو وا بکات و وا بلێت وە شەریش بکات لەگەل قورەیش ، خۆ قورەیش هەموو شتێکیان پێ دا چ دەسهەلات چ پارە چ ئافرەت بەلام ئەو هەر وازی نەهێنا بۆ چونکە ئەمە لەلایەن خوایە .

خالێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە هەموومان کاتێك ئیشێك دەکەین یان بەتەمای ئیشێك بین پێشتر راهێنانی لەسەر ئەکەین یان بیری لێ دەکەینەوە لە دوو سێ کەس ئەپرسین بۆ ئەوەی رای ئەوانیش وەرگرین ، باشە پێغمبەری خوا ﷺلە تەمەنی چل سالی بانگەشەی پێغمبەرایەتی کرد ئەبێ بپرسین بۆچی لە پێش ئەوە رۆژێك لە رۆژان باسی پێغمبەرایەتی لای کەسێك نەکردووە یان پرسی بە کەسێك نەکردووە یان زانیاری کۆ نەکردیتەوە هیچ لۆژیکی نیە کەسێك بانگەشە بۆ کارێکی وا بکات و لەسەرەتای قورئان تەحەدای مرۆڤ و جن بکات تەنها یێك سورەت بێنن وەکوو قورئان کەچی رۆژێك لە رۆژان پێشتر باسی ئەم کارەی نەکردبێت یان لای کەسێك باسی نەکردبێت ئەمە چ عەقلێك قبول ئەکات وە ئەوە ١٤٤٠ سال زیاتر بەسەر دەروات تا ئێستا کەسێك نەیتوانیوە سورەتێك بێنێتن وەکوو قورئان یان هەلەییێکی لێ بدۆزێتەوە ، ئەگەر ئەمە لەلای خوای گەورە نەبێت کێ ئەم کارەی پێ ئەکرێت ، بۆیە ئەگەر راستیت بوێت و ئەهلی راستی بی ئەبێ ناچار بی دان بە راستی پێغمبەرایەتی محمدﷺدابنێی و بلێی **اشهد ان لا الا الة الله واشهد ان محمد رسول الله.**

# چەند خاڵێك لەسەر ژیانی

پێغمبەری خوا ﷺ گەیشتە ئەو تەمەنەی وەحی بۆ هات ئیتر ژیانی جیاواز دەبێت ، ئیتر ئەرکەکەی قورس دەبێت ، دەبێت لەمەودوا دەست بکات بە بانگەوازی ، دەبێت شەو رۆژ کاربکات ، چ کارێك ؟ کارێکی هێندە گەورە کە دەبێت بۆ هەتا هەتایا شوێن دەستی دیاربێت و ببێتە نموونە بۆ مرۆڤایەتی ، چ جۆرە نموونەیێك ، دەبێت نموونەیێکی وابێت کە هیچ کەم و کورتییێکی نەبێت لە هەموو ژیانی ، چونکە بچوکترین هەڵە وا دەکات ئەم بانگەوازەی ئەو بکەوێتە ژێر پرسیار ، پرسیارێکی وا کە دوژمنەکانیان شەو رۆژ بوختانیان بۆ دەکەن ، چجای ئەوەی خوا نەکات هەڵەیێك بکات دەبێت ئەوکات دوژمنەکانی چی بکەن ؟ بۆیە هەر بەراست ئەم ئەرکەی بۆ ئەو هاتووە زۆر قورسە ، قورساییێکی وا کە شاخەکان نەیان توانیووە ئەمە هەڵبگرن ، بۆیە دەبێت لە هەموو مرۆڤەکان جیاواز بێتن وەك چۆن پێشت جیاواز دەرکەوتووە لە نێو دورگەی عەرەبی و ناو مەککە ، بیرکەینەوە دەبێت ئەم پێغمبەرە گەورەیە چ رێگاییێك بگرێتە بەر بۆ ئەم بانگەوازیە بۆ ئەوەی تووشی شکست نەبێت و بۆ هەتا هەتایە ئەم بانگەوازە بمێنێتەوە و نەوە لەدوای نەوە شانازی پیێ بکاتن .

پێغمبەر ﷺ شارزای دورگەی عەرەبی بوو کە دەیزانی چۆنن و پێویستە چۆن مامەلەیان لەگەل بکاتن و دەست پێکی بانگەوازەکەی چۆن بێت و چۆن مامەلە

لەگەل دەوروبەری بکاتن ، راستە ناونیشانی ئێمە باسی پێش پێغمبەرایەتیە بەلام بۆ ئەوەی بزانن ئەم پیاوە عەزیمە چ لۆژیکێك بوو با بە کورتی سەیری شێوازی بانگەوازەکەی بکەین و بزانین بانگەواز چیە و بۆ ئەوەی شێوازی بانگەوازیش بزانین چۆن دەکرێت ...

## بانگەواز

بانگەواز هەر لە ناوەکەی دیارە کە بانگی خەلك ئەکرێ بۆ دینی خوا ، بۆ شارزا بوون لە ئیسلام ، بۆ ئەوەی لە تاریکای بێن بەرەو روناکای ، بۆ واز هێنان لە ناحەق ، بۆ دادپەروەری ، بۆ دل پاك بوونەوە ، بۆ واز هێنان لە جاهلیەت ، ئا ئەمەیە بانگەوازی ئیسلام ، ئەم بانگەوازە ئیسلامە سنوری نیە کە ئێمە بلێین تەنها وەلاتێك یان شارێك ئەگرێتەوە ، بەلکو سنوری وەلاتی نیە و بۆ تەواوی وەلاتەکانە ، ئەم بانگەوازە جیاوازی نەتەوەی نیە و ناتوانی بلێی تەنها بۆ کوردە یان تورکە یان عەرەبە ، بەلکو بۆ هەموو نەتەوەکانی جیهانە ، ئەم بانگەوازە تایبەت نیە بە سپی پێست یان رەشت پێست ...هتد بەلکوو بۆ هەموو رەنگەکانیشە ، ئەم بانگەوازە تەنها بۆ پیاو یان بۆ ئافرەت یان بۆ جنەکان نیە ، بەلکوو بۆ هەموو جۆرێکیانە بە مرۆڤ و جنەوە ، بۆیە ئەم بانگەوازە ئیسلامیە بۆ هەموو جیهانە بێ جیاوازی ، خوای گەورە ئەفەرمووێ : وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ ، واتە ئەی پێغمبەری خوا ئێمە تۆمان ناردووە تەنها رەحمەت بی بۆ هەموو جیهان ، خۆ ئەگەر ئەو بانگەوازەی ئێمەی موسلمان ئەیکەین دەربچێت لە رەحمەت بۆ جیهان ئەوا ئەبێ بزانین هەلەییێك هەیە لە شێوازی بانگەوازەکەی ئێمە کە ئەیکەین ، یاخود ئامانجمان بۆ خوا نیە و بۆ شتێکی دیکەیە هە بۆیە لە رەحمەت دەردەچێت .

ئەگەر سەیری سەرەتای هاتنی ئیسلام بکەین پێغمبەری خـوا ﷺ کـە شارزا بوو لە ناوچەکەی خۆی و خەلکەکەی و بەهۆی ئەوەی لای خوای گەورە وەحی بۆ ئەهات ئەو سەرەتاکەی بانگەوازێکی نهێنی دەست پێکرد ، هێندە نهێنی بوو لە کەس و کارەکەشی هەندێکی ئاگەداری بانگەوازەکە نەبوون و تاك تاك بانگەوازی ئەکرد ، چونکە پێغمبەری خوا ﷺ دەیزانی ئەگەر سەرەتا بڕواتە نێو شار وبە ئاشکرا بانگەواز بکات ئەوا لەوانەیە کەس لێی باوڕ نەکات ، چونکە شتێکی نوێیەو هیچ لە خەلکی نازانن ئەمە چی ئەلێ و داوای چی ئەکات و هیچ کەسێکیش تامی ئیمانی نەکردووە بۆیە شـتـەکە زۆر قـورس ئـەبوو ، بانگەوازی نهێنی دەست پێکرد لە کەسە نزیکەکانی هەتا چەند کەسێك ئەم دینە ڕاستیەیان بۆ ئاشکرا بوو چێژی ئیمانیان کرد ، یێکەم کەسیش خێزانە بەڕێزەکەی بوو ...

پاشان خوای گەورە داوای لێکرد کە بانگەواز بۆ عەشیرەتەکەی بکات : وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ (٢١٤) ، بۆ ئەوەی سنوری ئەم بانگەوازە بەرفراوانتر بێتن و کەسی زیاتر بێنە نێو بازنەی ئەم دینە و شارزای ئیسلام ببن و ئەم کەسانە ئەرکیان قورس ئەبێت و ئەبێت ئامادە بکرێن بۆ داهاتوو کاتێك بازنەی ئیسلام گەورەتر ئەبێت و بانگەوازەکە ئەبێت بە ئاشکرا ..

وە خالێکی دیکەش بانگەوازەکەی پێغمبەر ﷺهەر بۆیە سەرەتا ئاشکرا نەبوو ، چونکە ئەو بە یێك کات بۆ هەموو خەلکی شیکاری ئەم دینە بکـات کـاتی زۆری ئەویست و لەوانەیە هەمووان وەك یێك لەم دینە حالی نەبوایـە، بۆیـە

نهێنی بوو بۆ ئەوەی پەروەردەی هەندێك كەس بكات و لەداهاتوو هاوكاری بن بۆ تێگەیاندنی ئەم دینە ، وە هەروەها پاراستنی گیانی ئەو موسلمانانەی كە هاتوونەتە ناو ئەم ئیسلامە بۆ ئەوەی توشی كەمترین زیان ببن ، چونكە ئەوان لەنێو كۆمەلگایێك دەژیان زۆر زەحمەت دەبوو پێچەوانەی ئەوان بن و دینێكی جیاوازیان هەبێت .

دوای ئەوە بانگەوازی ئەم ئیسلامە لەنێو خەلكی بلاو بوویەوە ، دەنگوباسی ئەم بانگەوازیە زیاتر بەنێو شار و كۆلانی مەككە بلاوبوویەوە و خەلك زیاتر لیێ كۆبویەوە ، ژمارەی موسلمانان زیادی كرد ، پاشان پێغمبەر ﷺبە ئاشكرا بانگەوازی دەست پێكرد و ئەمجارە بۆ هەموو شارەكە بوو و هەموو خەلكی مەككە ئاگادار بوون ، بۆیە قۆناغێكی نوێی بانگەوازی دەستی پێكرد و پێغمبەری خوا ﷺ لەگەل هاوەلە بەرێزەكانی كەوتە نێو هەولێكی بێ وچان و بەردەوام بوو لە بانگەوازەكەی و ئەوكات قورەیش هەستی بە مەترسی كرد و ئەوانیش دەستیان كرد بە دژایەتی كردنی پێغمبەر ﷺ ، لێرەدا پێغمبەری خوا ﷺئەبێت رێگای بانگەوازی بگۆرێت بۆ ئەوەی كەمترین زیان بە موسلمانان بكات و دەستی كرد بەوەی هەندێك هاوەلی بەرێز بۆ كۆچكردن بنێرێت بۆ شارەكانی دیكە ، چونكە لەوێ زیاتر ئەپارێزێن ، دوای چەند سالێك لە بانگەوازی لە مەككەی پیرۆز و موسلمان بوونی رێژەیێكی باشی خەلكی و نەبوونی دەست هەلات لە مەككە پێغمبەری خوا ﷺبیری لەوە كردەووە قۆناغێكی نوێ دەست پێ بكات و بروات بۆ شوێنێك خۆی دەسهەلاتی هەبێت و بۆ ئەوەی چیتر لەژێر دەستهەلاتی قورەیش نەمێننەوە ، دوای چەندین سال بانگەوازی كردنی خەلكی مەككە و زۆر بوونی رێژەی موسلمانان ، پێغمبەری

خوا ﷺ دەستی کرد بە ناردنی هاوەلان بۆ مەدینە بە گروپ گروپ و چەند قۆناغێك دوای خۆشی رۆیشت بۆ ئەوێ و خەلکی مەدینە پێشوازیێکی باشیان لێکرد و توانی لەوێ دەولەتێك دابمەزرێنێت کە خۆی سەرکردە بێت ، ئا لێرەدا یاساکان و بارودۆخ و شوێن گۆران هەر بۆیە ئەبێ شێوازی بانگەوازیش گۆرانکاری بەسەردابێت .

هەندێك کەس دەلێن ئەگەر سەرەتا پێغمبەری خوا ﷺ بانگەوازێکی نەتەوایەتی کردبا عەرەب بێ کێشە و زەحمەتی دەهاتن بەدەم ئەم بانگەوازە ، چونکە چەندین سال بوو هیچ هێزێکیان نەبوو ، لەلایێك رۆمەکان بوون و لەلای دیکەش فارسەکان بوون بۆیە عەرەب تینووی ئەوەە بوو هێزێکیان هەبێت و هەر هیچ نەبێت بەرگری لەخۆیان بکەن ، بەرگریێك کە زولم و ستەمی رۆم و فارسەکان لێی دوور بێتن ، بەلام چونکە ئەم بانگەوازە بۆ گشت جیهانیانە و تەنها بۆ نەتەوەیێك نیە نەدەگونجا بانگەوازیێکی نەتەوایەتی بێت ، وەهەروەها ئەگەر ئەم بانگەوازە نەتەوایەتی بووایە ئەوا بۆ تەنها ناوچەیێك دەبوو و مانەوەی ئەم بانگەوازەش بۆ چەند سالێك دەبوو ، بەلام بانگەوازی محمد ﷺ بۆ ئەوە بوو کە مرۆڤایەتی رزگار بکات و دل و دەرونیان لە تۆز خاوێن بکاتەوە و عەقیدەیێکیان فێربکات کە لەگەل سروشتی مرۆڤ بگونجێت و بگەرێنەوە سەر ئەصلی مرۆڤ بوونی خۆیان ، دەتوانم بێ دوو دلی بلێم قورئان لەگەل سروشتی مرۆڤ دەدوێت ، سروشتی مرۆڤ بێك خوای ئەوێت ، سروشتی مرۆڤ ئەیەوێ هاوبەش بۆ خوا بریار نەدات و خوایێك مرۆڤی دروست کردووە و ئەبێ سروشتەکەی مرۆڤیش داوای ئەوە بکات کە ئەو خوایە بپەرستێت نەك چەندین خوا کە لە بەرد و خۆل دروست کرابێت ، بۆیە لە ئەنجامی ئەم

بانگەوازە بەردەوامەی پێغمبەر ﷺتوانی عەقیدەیێکی راست و دروست لەنێو دلی هاوەلان بچەسپێنێت ، عەقیدەیێك کە هیچ شتێك نەتوانێ پاشگەزی بکاتەوە لەم بیروباوەرە ، عەقیدەیێك کە سروشتی مرۆڤ تینووی بوو ، عەقیدیێك کە ئامادە بوون هەموو سەروەت و سامانی خۆیان لەرێگای دا ببەخشن ، عەقیدەییك کە ١٤٠٠ سالە موسلمانان شانازی بەو نەوەیە دەکەن ، عەقیدەیێك کە زوولمی دوو ئیمپراتۆریەتی لەناو برد ، عەقیدەیێك کە جەهالەتی عەرەبی خاپور کرد ، عەقیدیێك کەهەموو کایەکانی ژیانی گۆری ، عەقیدەییك کە ئامانجەکەی ئەوەبوو وە توانیٚ بەندەکان لە تاریکای بێنن بۆ روناکای هەروەك چۆن خوای گەورە ئەفەرمووی : سورەتی الاحزاب(١٠):

هو الذي يصلي عليكم وملائكتة ليخرجكم من الظلمات الي النـور وكان بالمؤمنين رحيما(٤٣) . ئەمە ئامانجی بانگەوزەکەی محمد ﷺبوو نەك بانگەوازیێکی نەتەوەی یان مادی یان کۆمەلایەتی یان رەوشتی ، ئەمانە هەمووی بەشێك بوون لە ئامانجەکەی بەلام عەقیدە بناغەکەی بوو هەتا بتوانیٚ دل و دەرونی موسلمانان بگۆرێت و لە تۆز گرتی پاك ببنەوە .

هەموو موسلمانێك کە دەست ئەکات بەبانگەوازی ئەبیٚ زانیاری باشی هەبێت لە شەرعی ئیسلام و زانست ، چونکە بەبیٚ زانست ئەبیە بار بەسەر ئیسلام و بانگەوازیەکەت لەجیاتی سوود ئەبێتە مایەی نەگبەتی و ئەبیٚ بزانی لە چ شوێنێك چی ئەلێی و لە چ شوێنێك چی پێویستە بلێی ، وەهەروەها ئەبیٚ کەسێکی بوێر بی و بەردەوام بی لەسەر ئەم بانگەشەیەی کە دەستت پێکردووە و راستگۆی خۆتت بپارێزی و کەسێکی رەق نەبی لەکاتی بانگەوازی کردندا وە بەباشترین و جوانترین شێوە بانگەوازیەکەت بکە وەك چۆن خوای

گـەورە ئەفـەرمووێ : ادْعُ إِلَـيٰ سَـبِيلِ رَبِّـكَ بِالْحِكْمَـةِ وَالْمَوْعِظَـةِ الْحَسَنَةِوَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُبانگەواز بکە بـۆ لای بەرنامـەو ڕێبـازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری جوان و بەجێ،و گفتو گـۆو موجادەلەبەجوانترین شێوە.

ئەوکاتە بانگەوازیەکە بەرهەمی دەبێت ودەبێتە مایەی خۆشبەختی بۆ مرۆڤ و جنەکان .

# بۆچی پێغەمبەر ﷺ سەرەتای گەنجی بانگەوازی نەکرد ؟

ئەگەر بە گشتی سەیری ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەین چەند شتێك بۆمان ئاشکرا دەبێت و باسی چەندین رووداویشمان کرد ، بەلام ئەوەی گرنگە بە گشتی بلێین ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بەوە دەکرد ملەتەکەی کارێکی هەلە دەکەن کە ئەم تاوانانە دەکەن و ئەم بەد رەوشتیە کارێکی دروست نیە ، بەلام خۆشی نەیدەزانی چۆن پێیان بلێتن و بەرەو کام رێگا بانگیان بکات ، چونکە هیچ بەدیلێکی دیکەی نیە ، هەر بۆیە تۆ لەم سەردەمەش دەبینین کە دژایەتی هەر رێباز یان فکرەییێك بکەی ئەگەرچی ئەوانەی دژایەتیشیان دەکەی هەلەبن ، بەلام تۆ هیچ بەدیلێکی دیکەت پێ نەبێت ئەوا ناتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنی ، بەلام دەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت ئەو خوایەی محمد ﷺ دەپاراست لە شتە خراپەکان لە تەمەنی پێش پێغمبەرایەتی هەر ئەو وای کردبێت کە پەلە نەکات لەوەی بەوانی دیکە بلێت ئەم کارە نەکەن ، چونکە خوای گەورە پەیامێکی گەورەی بۆ پێیە لە داهاتوودا کە جیهان دەگۆرێت ، ئەو جیهانەی سەرتاپای بووە بە زولم و ستەم ، ئەگەرچی پێغمبەری خوا ﷺ نارەحەتی خۆی دەربریووە بەم کارەی گەلەکەی هەر بۆیە جار جار بەتەنها بووە و چووە بۆ ئەشکەوت ، سروشتی مرۆڤیش وایە ئەگەر لە شوێنێك ئارام نەبێت و هەست بە بێزاری بکات لە نێو کۆمەلگایێك ئەگەر هیچ شوێنێکی دیکەی نەبێت ئەوا هەول دەدات بەتەنها بێتن ، چونکە تەنیایی ئەگەر ئارامیشی پێ نەبەخشێت ، بەلام زیاتر تووشی خەفەتی ناکات .

**خالێکی دیکە کە ئەوەیە محمد ﷺ دەیزانی چۆن خەلك دێتە سەر رێگای ئەو بانگەوازیەی ئەو ، چونکە جۆری نەخۆشیەکانی کۆمەلگەی دەزانی و دەیزانی چ جۆرە نەخۆشیەکیان هەیە ، وە لە چل سالیش وەحی بۆ هات واتە دەرمانی بۆ هات ، ئەو دەرمانەی دەتوانێت چارەسەری هەموو برینەکانی مرۆڤ بکاتن بۆیە خەلك کە ئەم بانگەوازەی قبول کرد ، وە توانی شۆرەشێك بکات کە دوای ١٤٤٠ زیاتریش ماوە و بێ دوو دلیش دەمێنێت هەتا ئەوکاتەی زەمانی کۆتای دێتن .**

# محمدﷺ و ڕۆشنبیری

ئەگەر بە گشتی سەیری جیهان بکەین و بەتایبەتی دورگەی عەرەبی کە ئەو سەردەمەی محمد ﷺدەژیا لە ماوەی چل سالی سەرەتا چەندین نەخۆشی بوون کە چارەسەر کردنی قورس بوو ، بەلام ئەم پیاوە گەورەیە توانی چارەسەری بکات بەوەی کە دەیزانی چۆن هەلسوکەوت بکاتن ، ئیستا من باسی هەندێك لەو نەخۆشیانە دەکەم ، ئەگەر تۆزێك شارزای ژیانامەی پێغمبەرایەتی بی ئینجا شایەتی ئەوە بدە کە من راست دەڵێم یان نە ...

یێکەم : بتپەرستی کە لە کۆمەلگای پێغمبەر ﷺزۆر بەربلاو ببوو و لەو تەمەنەی ژیانی تیا بوو چەندین بتی گەورەو بچوك هەبوون کە خەلك دەیانپەرست کە ئەمەش گەورەترین نەخۆشیە کە لە نێو گەلێك بوونی هەبێت ، چونکە خوای گەورە بە گەورەترین تاوانی هەژمار کردووە ، بەلام پێغمبەری خوا ﷺبەوەی کە ئەیزانی نەخۆشیەکە چۆن چۆنیە و خوای گەورەش دەرمانی ناردبوو بۆی بە کارێزمای خۆی توانی ئەم نەخۆشیە لەناو بباتن هەر کەسێکیش تۆزێك شارزای ژیان نامەی بێتن ئەم راستیەی بۆ دەردەکەوێت یاخود تۆزێك مێژووی خوێندبێت یاخود با سەیری ئێستای مەککەش بکات ئایا بت پەرستی تێدا ماوە یاخود پێغمبەر ﷺ لەناوی برد ؟

بێ رەوشتی : پێش ئەوەی پێغمەر ﷺ ببێت بە پێغمبەر بێ رەوشتی لەو پەری بلندی بوو بە شێوەیێکی زۆر بەربلاو کە هیچ سیماییێکی ئەخلاقی

نەمابوو لەنێو کۆمەلگادا ، بەلام پێغمبەری خوا ﷺتوانی چارەسەری بۆ ئەم نەخۆشیەش بدۆزێتەوە و نەهێلێت ، تەنانەت هەتا ئەو رادەیەی کە هیچ کەسێك بۆی نەبوو سەیری ئافرەتێکیش بکات چجای ئەوەی تەعەدای ناموسی لێ بکات یان دەست درێژی بکاتە سەری وە بۆ ئافرەتیش نابێ لەشی دەربخات ، چونکە سەرنجی پیاو رادەکێشێت و بەرەو کاری دیکە دەبات ، بەکورتی رێگای بلاو بونەوەی بەدرەوشتی لێگرتن ، کە بەداخەوە ئیستا ئەم نەخۆشیە زۆر بلاو بۆتەوە لەنێو ئێمەدا .

ئابوری : پێش ئەوەی پێغمبەری خوا ﷺوەحی بۆ بێتن لە جیهان بەگشتی و کۆمەلگای عەرەبی بە تایبەتی دوو چینی  خەلکی هەبوون هەژار و دەولەمەن ، هەژارەکان هەر هەژارتر دەبوون و دەولەمەندەکانیش هەر دەولەمەند دەبوون چونکە هەژارەکان زولمیان لێ دەکرا لەلایان خەلکی دیکە و مافیان دەخورا ، بەلام پێغمبەری خوا ﷺلەرێگای قورئانەوە توانی ئەم زولم و ستەمە نەهێلێت و چینی مامناوەند زیادکر وە تەنانەت زەکاتیش فەرزکرا لەسەر دەولەمەندەکان ، بەم شێوەیە چارەسەری ئەم نەخۆشیەش کرا .

کۆمەلایەتی : پێش ئەوەی پێغمبەری خوا ﷺوەحی بۆ بێتن کام هۆزە بەهێزتر بووایە زولمی لەوەی دیکە دەکرد و مالی ئەوانی دیکەیان دەخوارد و لەسەر ئاستی تاکیش کۆمەلگا لەسەر خزم و دۆستایەتی مامەلەیان لەگەل یێکتری دەکرد نەك لەسەر حەق و ناحەق ، کە پێغمبەری خوا وەحی بۆ هات بە ماوەییێکی کەم ئەم دیاردەیەی نەهێشت تەنانەت تا ئەو رادەیەی وتی ئەگەر کچەکەشم دزی بکات ( دزی کردن زولم کردنە لە خەلکی ) ئەوا دەستی دەبرم

، وه لەرووی کۆمەلایەتیش خەلکی کردە برای یێکتری تەنانەت هـۆزی لێـك عاجزبووی پێك شاد کردەووە و پێی وتن ئێوە برای یێکترین ، بەم شێوەیە چارەسەری ئەم لایەنەشی کرد .

خوردنەوەی عەرەق : دورگەی عەرەبی کەم کەس هەبوو عەرەق نەخواتەووە ، بەلام دوای وەحی لەرێگەی قورئانەوە پێغمبەری خواﷺقۆناغ بـە قۆنـاغ چارەسەری ئەم کێشەی کرد .

کۆیلە : لە پێش هاتنی ئیسلام کاتێ جەنگەکان خەلك دیلی شەری دەکرد بە کۆیلەی خۆی ، بەلام دوای هاتنی وەحی پێغمبەری خوا ﷺچەندین رێگـای گرتە بەر بۆ چارەسەر کردنی ئەم دیاردەیە وە هانی خەلکی دەدا کە کۆیلەکان ئازاد بکەن و ئازاریان نەدەن .

حوکم رانی : بەرێوەبردنی وەلات پـێش وەحـی لەسـەر بنـەمای هێـز بـوو و ئەوکاتیش قورەیش دار الندویەی هەبوو کە کۆدەبوونەوە ، بەلام دوای وەحی پێغمبەری خوا ﷺرازی نەبوو ببێتە هاوپەیمان لەگەلیان چونکە حەق و ناحەق هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە بۆیە بە تێپەر بوونی کات حوکمی گرتە دەست و ناحەق بوونی نەما .

هەموو ئەمانە و چەندین کێشەی دیکە کە پێغمبەری خوا ﷺ چارەسەری کرد لە کۆمەلگادا قۆناغ بە قۆناغ بوون و بەپێی بار و زروف بوون شوێن و کات گرنگی زۆری هەبوو بۆ پێغمبەر ﷺئەیزانی لە چ کاتێك یاخود لە چ شوێنێك چ شتێك دەلێتن بۆیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا ، ئەو باش کۆمـەلگای خـۆی

خوێندبوویەوە وەك لە سەرەوە باسمان كرد ، كە بەداخەوە ئیستا ئێمە گرنگی بە كات و شوێن نادەین و نازانین لە چ شوێنێك چی پێویستە بلێین و لە چ شوێنێك پێویستە بێدەنگ بین ، بەشێكی زۆری موسلمانان بەزۆر ئەیانەوێ خۆیان لە كۆمەلگا دوور بكەنەوە جیاواز لە پێغمبەرەكەیان كە بەتەواوەتی تێكەیشتبوو كۆمەلگاكەی پێویستی بە چیە چ دەرمانێك بۆ چ شوێنێك گونجاوە ، راشكاوانە دەلێم زۆربەی موسلمانانی ئیستا دەرمانیان پێیە بەلام نازانن بۆ كام برین بەكاری بێنن .

بیربكەوە پێغمبەرﷺخۆی جیاكردبایەوە لە خەلك ئایا بانگەوازەكەی سەركەوتوو دەبوو وەك ئەوەی ئیستا ؟ بەدلنیایەوە نەخێر ، چونكە پێغمبەری خوا ﷺدەیزانی ناخی بەرامبەر چی پێویستە و ئەم قورئانەش دەگونجێت لەگەل سروشتی مرۆڤ چونكە كەلامی خوایەو ئێمەش بەندەی ئەوەین چۆن دەگونجێت دوو شتی پێچەوانەی یێكتری بن ؟ بەدلنیایەوە نەخێر هەر بۆیەش پێغمبەری خوا ﷺدەرمانەكەی بەكارهێنا بۆ شوێنی گونجاو و سەركەوتنی بەدەست هێنا .

# بۆچی خوای گەورە مەککەی هەڵبژارد ؟

کاتێك خوای گەورە پێغمبەرێك دەنێرێت بۆ مرۆڤایەتی ئەوا بەپێی کەش و هەوای ئەو ناوچەیە دەینێرێت بۆ نموونە پێغمبەری وا هەبووە بۆ تەنها ناوچەیێك هاتووە ، هی واش هەبووە بۆ تەنها گەلێك هاتووە هی واش هەبووە بۆ چەند شارێك هی واش هەبووە بۆ هەموو دونیا هاتووە وەك پێغمبەر محمد ﷺ کە بۆ هەموو جیهان هاتووە ، بەلام پرسیارەکە لێرە ئەوەیە ، بۆچی لە شاری مەککە بووە بۆچی شارێکی دیکە نەبووە ؟

سەرەتا دەبێت بۆ وەلامی ئەم پرسیارە بگەرێینەوە ئەو سەردەمە کە پێغمبەری خوا ﷺ لە مەککەی پیرۆز دەژیا ، هەموومان دەزانین عەرەبەکان هیچ دەسەلاتێکیان نەبوو ئەوکات وە رێژەی خوێندەواری زۆر کەم بوو تیایان دا بە رادەیێك هیچ نوسەرێك بوونی نەبوو لەو ناوچەیە ئەو کەسانەشی کە خوێندیان دەزانی رێژەیێکی زۆر زۆر کەم بوون ، لە دەوروبەری ئەوانیش دوو وەلاتی زلهێزی گەورەی خاوەن شارستانیەت هەبوون کە هەر یێکێك لەوان ناوچەیێکی زۆریان داگیر کردبوو ئەوانیش فارس و رۆمەکان بوون کە هێزێکی زۆریان هەبوو وە نووسەر و رۆشنبیریان تیابوو واتە خاوەنی شارستانیەت بوون ، لە نێوان ئەم هەردوو ئیمپراتۆریەش دا دورگەی عەرەبی وشك هەبوو کە خاوەنی شارستاینێك نەبوون ، بۆیە گریمان ئەگەر پێغمبەر لەناو فارسەکان هاتبا رۆمەکان دەیان وت ئێمە باور ناکەین ، چونکە فارسەکان خاوەنی شارستانیەتن و نوسەرەکان ئامادەیان کردووە ، ئەگەر لەلای رۆمەکانیش هاتبایە ئەوا فارسەکان هەمان شتیان دەوت ، بۆیە لە نێو مەککە هەلبژێردرا بۆ

ئەوەی هیچ گومانێك نەمێنێت  لەسەر راست و دروستی پێغمەر ﷺبەم جۆرە فارس و رۆمانیەکان رۆژێك لە رۆژان بە محمد ﷺنەوتووە تۆ لە فلان کـەس فێری زانست و زانیاری بووی بۆیە ئەم شتانە دەلێی ئەمەس لەبەر نەبوونی شارستانیەت .

خالێکی دیکە کەعبەی پیرۆز مالی خوایە بۆیە هەم بارودۆخەکە گونجاو بوو هەم خوای گەورە وای دەخواست کە کۆتا پێغمبەر نزیك بێت لە مالی خۆی ﷺ

# شـــايانی باســـه چـــوار جـــار كەعبـــەی پـــیرۆز نوێكراوەتەوە :

**جـــاری یەكـــەم:** بـە دەسـتی حـەزرەتی (إِبْـراهِیم) پێغەمبـەر و حـەزرەتی (إِسْـماعِیل) پێغەمبەر-صلى الله وسلم عليهما - كە باسمان كرد.

**جاری دووەم:** به دەستی (قُرَیْش) كە پێغەمبەریش ﷺ بەشداریی كرد، بەڵام ((قُرَیْش) به ناتـەواوی دروسـتیان كـردەوە، بۆیـێ پێغەمبـەر ﷺ ئـارەزووی هـەبوو: وەك سـەردەمی حەزرەتی (إِبْراهِیم) پێغەمبەر ﷺ دروستی بكاتـەوە، هـەروەك لـە حەدیسـەكەیڕابردووی حەزرەتی (عائِشَة)دا-رَضِيَ اللهُ عنها- باسمان كرد.

**جاری سێیەم:** به دەستی حەزرەتی (عبدالله بن الزُّبَیْر)-رَضِيَ اللهُ عنهما-، لـەو كاتـەی لەشـكری (یَزِید بن مُعاوِیَة) به سەركردایەتی (الحُصـین السُّكُونی) گـەمارۆی (مَكَّـة)ی پیرۆزیـان دا؟ چونكە حەزرەتی (عبداللهرضي الله عنه) دەستەڵاتداریەتی (یَزِید)ی قبوڵ نەكرد و ئەمیرایەتی خۆی لە (مَكَّة)دا ئاشكرا كرد، ئینجا لە شكرەكە بـە مەنجـەنیق بۆردومـانی (كَعْبَـة)ی پیرۆزیـان كرد و بەشێكیان لێ سوتاند و ڕوخێندرا، ئینجا كە (یَزِید) مرد، لەشـكرەكە بـەرەو (شـام) گەڕاوە.

ئینجا حەزرەتی (عبداللهرضي الله عنه) سەر لـەنوێ (كَعْبَـة)ی بـە تـەواوی دروسـت كـردەوە: وەك ئـەو نەخشەیەی پێغەمبەر ﷺ ویستبووی-كە لە حەدیسەكەی حەزرەتی(عائِشَة)دا-رَضِيَ اللهُ عنها- ڕابـرا- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزرەتی(ابن عَبّاس)-رَضِيَ اللهُ عنهما-ئامۆژگـاری حـەزرەتی (عبـدالله)ی كـرد: كـە تـەنها ڕوخاوەكـە چـاك بكاتـەوەو دەسـتكاری هـە مـوو (كَعْبَـة) نـەكاو وەك سـەردەمی پێغەمبەر ﷺ بیهێڵێتەوە. بەڵام حەزرەتی(عبدالله)رضي الله عنه گوێی نەدایێ.

**جاری چوارەم:** به دەستی (الحَجّـاج الثَّقَفِـي) لـە سـەردەمی ( عَبْـدالْمَلِك بـنِ مَـرْوان)، واتـە: ئـەم جارە لەشكری(عَبْدالْمَلِك) بە سەركردایەتی(الحَجّاج) هێرشـی هێنـاوە سـەر (مَكَّـة)ی پـیرۆز و حەزرەتی (عبدالله بن الزُّبَیْر)ی-رَضِيَ اللهُ عنهما- شـەهید كـرد، ئینجـا (الحَجّـاج) بـە فـەرمانی (عَبْـدُالْمَلِك):

دروستکردنەوەکەی حەزرەتی ( عبدالله بن الزُّبَیْر)ی رَضِيَ الله عنهما تێك دا و (حِجْر إِسْماعِیل)ی وەك خۆی لێکردەوەو دەرگەی دووەمیشی داخست: وەك ئێستا لە بەرچاوە.

ئینجا کە (أُمَوِيّ)یەکان لە دەسەڵاتدا نەمانو (عَبّاسي)یەکان هاتنە سەر دەسەڵات، خەلیفەکانی (الْعَبّاسي): (المَنْصُور)و (المَهْدِي)و (هارُون الرَّشِید) هەر یەکەیان ویستی دروستکراوەکەی (الحَجّاج) تێك بداتەوەو وەك دروستکراوەکەی حەزرەتی (عبدالله بن الزُّبَیْر)رَضِيَ اللهُ عنهما – بە نەخشەکەی پێغەمبەرﷺدروستی بکاتەوە، بەڵام ئیمام (مالك) بە هەر یەکەیانی گوت: **(ناشَدْتُكَ اللهَ یا أَمِیرَ الْمُؤْمِنِین: أَلاّ تَجْعَلَ هَذا الْبَیْتَ مَلْعَبَةً لِلْمُلُوك...فَتَذْهَبَ هَیْبَتُهُ مِنْ صُدوُرِ النّاسِ)** بۆ خاتری خوا تکات لێدەکەم ئەی گەورەی موسوڵمانان: ئەمماڵەی خوا مەکە گاڵتەجاڕی پاشایەکان، هەر پاشایەك بیەوێ بە دڵی خۆی دەستکاریی بکا، نەوەك ترسو ڕێزداریەکەی لە دڵی خەڵك بڕواتە دەرەوە. بەڵێ: بەم جۆرە ئیمام (مالك) هەر یەکەیانی لە بڕیارەکەی لادا. (فتح الباري) ب(٣) ل(٥٥٤–٥٦٦).

## دەبێت محمد ﷺ چاوەڕێی چی بکات ؟

لەگەڵ هاتنی وەحی بۆ محمد ﷺ ﷺ دونیا گۆرانکاری بەسەر داهات بۆ محمد ﷺ جیهانێکی دیکە دەست پێ دەکاتن ، روداوەکان جیاوازتر دەبن ئەمجارە محمد ﷺ دەبێت چاوەڕێی پەرچە کرداری گەورە بکات ، چونکە ئەمە شەری فکرە دەبێـت روبـەروی قـەومێك ببێتـەوە کـە رۆچـوون لـە زولم و سـتەم و بتپەرستی ، دەبێت روبەرووی قەومێك ببێتەوە کە هیچ سیمایێکی شارستانیان نیە ، دەبێت چ هەستێك بێتن تۆ برۆیتە لای خەلك چیان پێ بلێیت ؟ بلێیت من پێغمبەری خوام ، خوا منی بۆ ئێوە ناردووە ! ئەم کارە کارێکی هەروا ئاسان نەبوو بۆ محمد ﷺ ، چونکە دەیزانی قەومەکەی لە چ ژینگـەیێك پـەروەردە بوونە هەر بۆیە محمد ﷺ لای قورس بوو وە دوای چونی بـۆ لای وەرەقـەی کوری نەوفەل زیاتر بۆی روون بوویەوە کە تووشی نارەحەتی و ناخۆشی دێتن ، کاتێك وەرەقەی کـوری نەوفـەل پێـی راگەیانـد کـە قەومەکـەت دەتکەنـە دەرەووە لەم شارە !

محمد ﷺ دەبێت چاورەێی ئەوە بکات کە کاهینەکانی ئەو سەردەمە دژیان دەوەستن ، چونکە بتەکانی ئەوان دەکەوێتە مەترسی و لە شوێنی بتەکانیان لا اله الا الله دێتن و عەقیدەی ئیسـلامی دێتـە پـێش و کۆتـای بـە خورافیـاتی بتپەرستی دێتن ، بۆیە ئەوانیش پەرچەکرداریان دەبێت و هەرواش بێـدەنگ نابن ، بەتایبەتی ئەوان خاوەن هێزن و هەرچی پێویست بێت هەیانە ...ئەگەر

سەیری ژیانامەی پێغمبەر ﷺبکەین دەبینین بە ئاشکرا قەومەکەی دژایەتیان کرد و کاهینەکانی لات و عوزا دژی وەستان و شاربەدەریان کرد تەنانەت ئازاری وایان دا کە حیسار بخرێتە سەریان ، هیچ کەسێك بۆی نەبوو نە شتیان لێ بکرێت نە شتیان پێ بفرۆشێتن وە مال و سامانیان لێ تالان کرد .

دەبێت محمد ﷺچاوەڕێی ئەوە بکات کە دەولەمەندەکانی قورەیش و مەککە دژی بوەستن ، چونکە زۆربەی زۆریان بە زولم ئەم مالەیان دەست کەوتووە هەروەها ئەم پەیامەی محمد ﷺنەهێشتی زولم و ستەمە بۆیە بەیێکداچوون ڕوودەدات.

دەبێت محمد ﷺچاوەڕێی ئەوە بکاتن فەرمان ڕەوایانی مەککە و جیهان دژی ئەو هێز بەکاردێنن ، چونکە ئەم پەیامەی ئەو دەسەلاتەکەیان لەناو دەبات و لەجێیگای ئەودا حوکمی لا اله الا الله جێبەجێ دەکات و حوکمرانی دەبێتە حوکمێکی ئیسلامی ، ئەگەر سەیری ژیانامەی محمد ﷺبکەین ئەم دژایەتیە زۆر دەبینین چ لە سەردەمی ئەودا یاخود دوای ئەو چەندین شەڕ ڕویان دا و دوژمنانی ئیسلام هێرشیان دەهێنا و دەست درێژیان دەکرد ، بۆیە موسلمانان پێویست بوو دەست بکەن بە جیهاد کردن .

# جیهاد

**جیهاد چیه و بۆچی دەکرێت ...**

**یە لە ئیسلامدا ، ئەوانیش :**

**یەکەم : جیهادی نەفس**

**دووەم: جیهادی قیتال و سەربازی**

**سێیەم: جیهادی بەخشینی موڵك و سامان**

**چوارەم : جیهادی وتنی حەق بە زمان بەرانبەر بە دەسەڵاتی خراپەکاران و زاڵمان**

**پێنجەم: جیهادی شەیتان**

**هەروەك لە فەرموودەکانی پێغمبەری خواش ﷺهاتووە باشترین جیهاد ئەوەیە قسەی حەق بکەی لەبەرامبەر سەرکردەیێکی زالم .**

**لە دوای ئەوەی پێغمبەری خوا ﷺچوو بۆ مەدینە و قۆناغێکی نوێ هاتە پێشەوە و موسلمانان بوونە خاوەنی هێز یاسای حوکم کردن جێبەجێ بوون و دادەبەزین ، لەم قۆناغەدا ئیسلام بە کردار هاتە نێو مەیدان ، ئەگەر پێشتر تەنها بانگەواز بووبێت ، ئیستا بەکردار یاساکان جێبەجێ دەکات ، ئیستاش دەبینین هەندێك کەس هەول ئەدەن ئەم دینە بکەن بە دینێکی تیۆری ! بێ**

ئاگا لەوەی دینی ئیسلام دینی کرداره و بۆ گۆرینی کۆمەلگا هاتووه و باروزروف ئەگۆرێت .

لێرەدا ئێمە زیاتر تیشك ئەخەینە سەر جیهادی قیتال کە ناحەزانی ئیسلام بە هەلە بلاوی ئەکەنەوە و ئەیانەوێ وا نیشان بدەن کە تەنها کوشتاری خەلکی بێ تاوانە ...

حوکمی جیهاد چیە :
خوای گەورە لەسورەتی بقرە ئایەت ٢١٦ دەفەرمۆێت
جیهاد لەسەر موسلمانان فەرزە: {كتب عليكم القتال وهو كره لكم} لەسەرتان جەنگ نوسراوە– لەگەلّ بێ باوەڕاندا بیکەن– دیارە جەنگیش شتێکی قورس و نارەحەتەو خۆشتان لێینایە، دلّ و دەروون حەزی پێ ناکا چونکە کوشتن و برین، بەخت کردنی دارایی و، بەجێ هێشتنی نیشتمانی تێدایە' بەلاّم ئەگەر چی ئاوایش بێت هەر جیهاد هۆی سەرفرازیتانە' {وعسي أن تكرهوا شيئا وهو خير لكم} لەوانەیشە لەشتێك حەزنەکەن و ناخۆش بێت لاتان، بەلاّم خێروچاکەی تێدا بێت و بەخێریش گەڕێ {وعسي أن تحبوا شيئا وهو شرلكم} رەنگە حەزتان لەهەندێ شت بێ و پێیشتان خۆش بێت کەچی شەڕو خراپ بێت و ئاکامەکەی باش نەبێ" مرۆڤ بە سروشت هەر دانیشتنی پێ خۆشە، بەلاّم دانیشتن وخۆدزینەوە لەجیهاد ڕیسوایی و ژێردەستەیی بەدواوەیە {والله يعلم وأنتم لا تعلمون} بێگومان خوا خۆی ئەزانێ چ شتێ چاکەو چ شتێ خراپە، بەلاّم ئێوە نایزانن.

له ئیسلامدا سێ جۆر خەلکی ناموسلمان هەیە ئەگەر موسـلمانان خـاوەنی هێزی خۆیان بوون .

یێکەم : ئەگەر کەسانێك شەر دژی موسلمان نەکەن و ئیشیان پێت نەبێت و نابێت تۆش قیتالیان لەگەلدا بکەی وەك چۆن خوای گەورە ئەفەرمووێ : لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِوَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ دڵنیـاش بـن کـه خـوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کەچاك ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردون و دژایەتی ئاینیان نەکردون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردون، چونکە بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

جۆری دووەمیان ئەوانەن کە پەیمان ئەشکێنن و شەر دژی موسلمانان ئەکەن و خوای گەورەش ئەفەرموو : وَقاتِلوا فِي سَبيلِ اللهِ يُقاتِلونَكُم و لا تعْتَدوا  إنَّ اللهَ لا يُحِبُّ (١٩٠) بجەنگن لەگەل ئەوانەی لەگەل ئێـوە ئەجـەنگن و دەست درێژی نەکەن ، چونکە خوای گەورە دەست درێژی کارانی خۆش ناوێت .

جۆری سێیەمیان ئەوانەن کە هیچ پـەیمانێکیان نـەبووە لەگـەل موسـلمانان وئەمانەش سێ ڕێگایان لەبەردەم دایە ، یان موسلمان ببن یان وەلاتەکە بەجێ بهێلن یانیش جزیە بدەن ( جزیە برە پارەییێکی کەمە کە کەمترە لەبەرامبەر ئەوە ئەدەن کە موسلمانان مولك و مالی ئەوان ئەپارێزن ، خۆ ئەگەر نەیان توانی بپارێزن ئەوا جزیە نادەن )

جیهادی قیتال دوو جۆری هەیە : جیهادی دەفع وجیهادی گلب ، جیهادی دەفع بۆ پاراستی سەروەت و سامانی موسلمانانە لەو هێرشەی دوژمنانی ئیسلام ئەکرێنە سەر موسلمانان .

جۆری دوەمیان ئەوەیە ئەگەر لە موسلمانان بینیان لە شوێنێك زولم هەیە و زولم ئەکرێت ئەوا پێویستە ئەو زولمە لەسەر ئەو خەلکە لابەرن بە جیهاد کردن ، بۆیە ئەتوانین بلێین هەتا زولم مابێت جیهاد کردن ئەمێنێت کەی زولم نەما ئەوا ئەوکات ئەتوانین بلێین جیهاد پێویست ناکات ، وە ئەبێ ئەوەش بزانین کە هەموو دونیا مولکی خوایە و موسلمانانیش بۆ ئەوە کار ئەکەن کە حوکمی خوا جێبەجێ ببێت لەسەر هەموو گۆی زەوی ، حوکمی خواش واتە دادپەروەری و ئاشتی و گەراندنەوەی مافی خەلکی بۆ خەلکی و جیاوازی نەکردن لەنێوان رەنگەکان و نەتەوەکان بەکورتی ئەتوانین بلێین حوکمی خوا واتە نەهێشتنی زولم و ستەم بۆیە هەتا ئەوکاتەی زولم و ستەم هەبێت جیهادیش ئەبێت .

موسلمانان بوون بە هێز و کاریگەریان هەبوو و توانیان ببنە خاوەنی خاکی خۆیان ، لەوکاتەدا موشریکەکان ئەمەیان لا قورس بوو و بۆیان قبول نەدەکرا ، هەرچەندە پێشتریش شەری موسلمانانیان ئەکرد ، بەلام ئەمجارە جیاواز بوو و دژایەتیەکە گەورەتر بوو ...
بۆیە فەرمانی کرد بە جیهادی قیتال دژیان و سەرکەوتنیشی بەدەست هێنا بەسەریان و ئەوانیش سەرشۆر بوون چونکە پەیمانامەیان شکاند و هێرشیان کردە سەر موسلمانان و خیانەتیان لێکرد ئەوکان جیهادی دەفع دەستی پێکرد

، پاشان موسلمانان دەستیان کرد بە جۆری دوەمی جیهاد لەو شوێنانەی زولم لە خەلك دەكرا .

# بۆچی قورئـان بە زمانی عەرەبی بوو ؟

خوای گەورە کە کتابی ئاسمانی دابەزاند بۆ سەر پێغمبەرەکانی دیکە هەر یێك بە شێوەییێك هەبوو بە شێوەی مصحف پێکەوە دابەزی وەك چۆن تەورات بۆ موسا علیە سلام دابەزی وە جۆرێکی دیکەش هەبوو بە شێوەی پارچـە بـە پارچە دادەبەزی واتە بە پێی روداوەکان کە قورئانی پیرۆز بەم شێوازە بوو ...

قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزی ...

.

یێکەم : چونکە پێغمبەر ﷺ زمانەکەی عەرەب بوو وەك چۆن موسا و عیسا علیهم سلام کتابەکانیان بە زمانی عیبری و ئارانی بوو کە تـەورات و ئنجیـل بوون ، بۆیە قورئانیش بە عەرەبی بوو ، چونکە محمد ﷺ لە نەتەوەی عەرەب بوو .

دووەم : خۆ هەر دەبوو بە زمانێك بێت نەك بە سەدان زمان لە یێك کاتـدا ، چونکە یێك پێغمبەر بوو و لەنێو هەر زمانێکیش چەند دیالێکت هەن و لەنێو هەر دیالێکتێك دا چەند شێواز هەن بۆ نموونە سەیری کوردستا بکـە چـەند زمانی جیاواز بوونیان هەیە ؟ تۆ بلێی ئەگەر سۆرانی بووایە منێکی بـادینی

دەموت بۆ بە بادینی نیە ، یان بادینی بوایە تۆ دەتوت بۆ سۆرانی نیە پاشان وەرەن نێو سۆرانی و بادینی هەر یێکیان چەند شێوازی جیاوازی قسەکردنیان هەیە ، واتە ئەم کێشەیە چارەسەر نەدەبوو .

سێیەم : وەك پێشتر وتمان پێوست بوو مەككە بێتە هەلبژاردن ، چونكە ژینگەییێكی لەبار بوو بۆ هاتنێ پێغمبەرێك بۆیە دەبێت بە زمانی ئەو خەلە بێتن .

چوارەم : زمانی عەرەبی دەولەمەندترین زمانی جیهانە لەرووی وشە و واتاكەی كە بە رستەییێكی بچووك واتاییێكی زۆر دەداتن .

بەلام باشترە بپرسین هیچ شتێك لە دەگۆرێت ئەگەر بە عەرەبی نەبووایە ئەی ئێمە هەموومان برای یێكتری نین بۆ جیاوازی نەتەوەی بكەین ، ئەی پێغمبەری خوا ﷺنافەرمووێ : ( لا فرق بين عربي و لا أعجمي و لا أبيض ولا أسود إلا بالتقوي )

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)﴿سورة الحجرات ١٣﴾
ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستكردووە (كەباوكەئادەم و دایكە حەوایە) و كردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەكتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەكەوە... بەڕاستی

بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبـەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەمووان.

# ئایا مرۆڤایەتی پێویستی بە هاتنی پێغمبـەرێك بوو ؟

بەپێی مێژوو باسکراوە کـە پـێش هـاتنی محمـد ﷺخـوای گـەورە چـەندین پێغمبەری دیکەی بۆ مرۆڤایەتی ناردووە بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لە ناخۆشی و زولم و ستەمکاری ، هەر بۆیە محمد ر پێویست بوو بۆ مرۆڤایەتی ، یـاخود دەتوانین بلێین پێش ١٤٤٠ سال مرۆڤایەتی پێویستی بە پێغمبەرێکی دیکە بوو بۆ ئەوەی رزگاریان بکات لە هـەموو نارەحـەتی و زولم و سـتەمە ، چـونکە شیرازەی کۆمەلگا روخابوو ، ژیان پرببوو لە زولم و ستەم مرۆڤایەتی بەجۆرێك تووشی ستەم ببوو کە مرۆڤ منـالی خـۆی زینـدە بەچـال دەکـرد ، لـەرووی پەرستنیشەوە تووشی شرك ببوون لە هەموو لایێـك ، نەتـەوەی وا هـەبووە ئاگری پەرستووە ، نەتەوەی وا هەبووە رۆژ و مانگی دەپەرست ، نەتەوەی وا هەبووە بتێکی دەپەرست ...ئاینە ئاسمانیەکانی دیکەش گۆردرابوون وتحریف کرابوون بۆ نموونە ئاینی مەسیحی ببوو بە ئاینی پۆلس و لۆقا و مەتا و یوحەنا ..هتد کە ئیستاش سەیریان بکەی لەجیاتی خوا قسە بکات هەر دەلێت پۆلس وای وت یاخود لۆقا یان مەتا یان فلانە وای وت یاخود باسی ژیانی عیسا علیە سلام دەکاتن ، بە هیچ شێوەیێك ئەو ئاینە نـەمابوو کـە عیسـا علیـە سـلام بانگەشەی بۆ دەکرد ، خـۆ ئەگـەر وەك خۆشـی مابوایـە ئـەوا جیهـان هـەر

پێویستی به پێغمبەرێك دەكرد چونكە عیسا علیـه سـلام تـەنها بـۆ نـەوەی ئیسرایل هاتووە نەك بۆ هەموو جیهان بۆ ئەمەش بەلگە هەیە لە قورئان و لە ئنجیل كە خوای گەورە دەفەرمووێت : (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ)﴿سورةتي الصف ٦﴾

بیریان بخەرەوە، كاتێك عیسای كوری مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم كەلە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بەپێغەمبەرێك كە دوای من دێت و ناوی – ئەحمەد –ە، كەچی كاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواوو موعجیزەی ئاشكراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەكی ئاشكرایە.

بەلام كەسانی وا هەن باور بەوە ناكەن و دەلێن خۆ مەسیحیەكان وانالێن بۆیە پێمان باشە سەیرێكی كتێبی پیرۆز بكەین ..

ئەگەر سەیری مەتا ( ١٠ : ٥_ ٦ ) عیسا علیه سلام به دوازده قوتابیەكانی دەلێت و فەرمانی پێكرد لە ڕێگادا جگە لە جولەكەكان مەرۆن و مەچنە هیچ شارێكی سامریەكان ، بەلام لەوپەری راستیدا برۆن بیر فەوتاوەكانی ئیسرایلیەكان )

ئینجیلی مەتا بەشی ١٥ دێری ٢٢

**ژنێکی کەنعانی خەڵکی دەوروبەری ئەویّ، دەرچوو و هاواری کرد: (گەورەم، کوڕی داود، بەزەییت پێمدا بێتەوە ! کچەکەم بە خراپی ڕۆحیپیسی تێدایە.)**
**٢٣**
**بەڵام عیسا بە وشەیەکیش وەڵامی نەدایەوە. قوتابییەکانی هاتنـە پێشـی و تکایان لێی کرد: (بەڕێی بکە، وا بەدوامانەوە هاوار دەکات.**
**٢٤**
**وەڵامی دایەوە : (من تەنها بۆ مەڕە ونبووەکانی ماڵی ئیسرائیل نێردراوم.)**

**وە هەروەها ئاینی موسا علیه سلام تحریف کرابوو و دەست نوسـی مرۆڤـی تیابوو هەرچەندە ئەویش جیهانی نەبوو و تەنها بۆ نەتەوییێك بوو ، وە هەروەها ئاینی ابراهیم علیه سلامیش بەشێکی کـەمی نـەبێت هیچـی نـەمابوو ، بۆیـە مرۆڤایەتی پێویستی بە ڕێنیشاندەرێکی دیکە هەبوو کە رزگاریان بکات لەم ناخۆشی و دەردەسەری و زولمەی کە جیهانی داپۆشیبوو .**

# پێغمبەر ﷺ مرۆڤێك بوو

زۆرێك لە ئاینەكانی پێشوو یاخود رێبازەكانی دیكە دوای ماوەیێك پێشەوای خۆیان لە سروشتی مرۆڤ بوون كردووتە دەرەوە و پلەیان لێ بەرز كردووتەوە ئەمەش یێكتا پەرستی تێكدەدات و هیچ مانایێكی بۆ تەوحید ناهێڵێتەوە ، خوای گەورە باس لەوە دەكات كە یەهودی و نەسرانیەكان پێغمبەرەكانیان كردووە بە خوا و كوری خوا هەر وەك چۆن خوای گەورە دەفەرمووێ :
(وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ ۖ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ ۚ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ)﴿سورة التوبة ٣٠﴾

جولەكە وتیان: عوزەیر كوڕی خوایە، گاورەكانیش وتیان: مەسیح كوڕی خوایە!! ئا ئەو بوختانە (نابەجێیانە) قسەی ئەوانە و بەدەم دەیڵێن و لێی تێناگەن (بیرێك ناكەنەوە، تیافكرن) ئەو گوفتارەیان لاسایی كردنەوەی ئەوانەیە كە پێشتر بێ باوەڕ بوون (لەوەدا كە دەیانوت فریشتەكان كچی خوان)، دەك بەكوشت چن و خوا لەناویان بەرێت، ئاخر ئەم بوختانە ناڕەوایانە چۆن هەڵدەبەستن.

جگە لە مانەش زۆربەی رێبازەكانی دونیا پێشەوای خۆیان دەپەرستن ئەگەرچی خۆیان كەسانی باش بوون و لەوانەیە باشی نەتەوەكەیان ویستبێت ، بەلام دوای كراون بە خوا و بیان پەرستن بۆ نموونە كۆنفۆشیوس یاخود دینی هندۆسی یاخود زەردەشت كە ئەمانە خۆی لەخۆیدا سەرەتا باشی خەلكیان

ویستبێت بەلام دوای بوون بە بتپەرست و ئاگر پەرست بۆیە لە ڕێگەی راستی خۆیان لایداوە .

بەلام ئەوەی جێگای دل خۆشیە خوای گەورە هیچ مەجالێکی بۆ ئەم باسە نەهێشتووتەوە هەر لە نێو قورئان بە پێغمبەر ﷺ دەلێت کە بە خەلك بلێت من تەنها مرۆڤێکم و هیچی دیکە نیم

خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾﴿سورةتي الكهف ١١٠﴾

(ئەی پێغەمبەرﷺپێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت (ئەم ڕاستیەتان تێبگەیەنم) کە: بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جا ئەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شادبێت، بەخۆشنودیەوە با کارو کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەك لە پەرستندا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی.

هەروەها دەفەرمووێ : ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ﴾﴿سورةتي فصلت ٦﴾

ئەی پێغەمبەر ﷺپێیان بڵێ: دڵنیابن کە من هەر بەشەرێکم وەك ئێوە، (جیاوازیەکە تەنها ئەوەیە): من وەحی ونیگام بۆ دەکرێت کە بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاك و

تەنهایە، کەوابوو ئێوەش ڕووی تێ بکەن، بەڕاستی بیپەرستن" لە ڕێبازەکەی لامەدەن، داوای لێخۆشبوونی لێبکەن و چاك بزانن کە وەیل و سزای سەخت بۆ موشریك و هاوەڵگەران ئامادەیە.

لێرەدا خوای گەورە بۆ ئەمە ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ ئەوەی هیچ کەسێك محمد ﷺبەرزتر نەکاتەوە لە مرۆڤبوون ، تەنانەت پێغمبەری خوا ﷺلە حەدیسێك دا بە فاتیمەی کچی دەڵێت ، ئەگەر من مردم ناتوانم هیچ شتێکتان بۆ بکەم .

ئەوەی ئیستا دەبینین لە جیهانی ئیسلامی دلخۆشکەرە لەم لایەنەوە کە تا ئیستاش هیچ موسلمانێك نالێت محمدﷺ ﷺمرۆڤ نەبووە یان بیپەرستێت بۆیە تەنها وەك پێغمبەرێك سەیری دەکەین و ڕێزی لێ دەگرین و هەر گوێمان لە ناوی بێت صەلاواتی لەسەر لێدەدەین ، بەلام بەداخەوە کۆمەلێ موسلمان هەندێك کەسی دیکەیان گەورە کردووە بە پلەییێك کە گەورەتر لەوەی خۆیان ، ئەگەرچی خۆشیان بانگەشەی ئەوەیان نەکردووە ، هەر بۆ نموونە لەنێو موسلمانان کۆمەلێك جیابوونەتەوە بەناوی یەزیدیەکان و ئیستا تەواو خۆیان بە ئیسلام هەژمار ناکەن ، بەلام لە راستیدا ئەمانە سەرەتا فیرقەییێك بوون خۆیان بە شوێن کەوتووی عودەی کوری موسافیر هەژمار دەکرد ، ئەگەرچی عودەی کوری موسافیر کەسێکی موسلمانی زیرەك و لێهاتوو بوو بەلام ئەم فیرقەیە هێواش هێواش زیادەرۆیان تیاکرد و هەتا پلەی پەرستن و گەورەتریان کرد لە پێغمبەریش ، یاخود هەندێك موسلمان ئیستا لە رادەبەدەر شێخ عبدالقادری گەیلانیان گەورە کردووە کە وەك مێژوو باس دەکات خۆی پیاوێکی باش و زانا بووە و ئەگەر زیندوو ببێتەوە هەرگیز بەوە رازی نابێت کە ئیستا هەندێك لە شوێنکەوتوانی دەیکەن .

وەك باسمان كرد لەم لایەنە پێغمبەر ﷺ تا ئیستاش لای ئێمەی موسلمان تەنها پێغمبەرێكە بروامان پێیەتی ، بەلام دەبێت باسی ئەوەش بكەین كە كۆمەلێك چیرۆك لەنێو موسلمانان بلاو بونەتەوە بەدەم پێغمبەر كراون كە ئەسل و ئەساسی نیە بۆیە پێویستە ئەم شتە خورافیانەش نەمێنن لەنێو كۆمەلگای موسلمانان ، ئەمەش ئەوكاتە نامێنن كە موسلمانەكان شارزای دینەكەی خۆیان ببن بە زانست ، بۆ نموونە ئیستا لە زۆر كەس بپرسی بلێی خوای گەورە بۆچی دونیای دروست كردووە دەلێن لەبەر خاتری پێغمبەر ﷺكە ئەمەش دوورە لە راستی و خورافیاتە ، چونكە خوای گەورە لەبەر خاتری هیچ كەسێك دونیای دروست نەكردووە و ئەم باسەش نە لە قورئان دا هەیە نە لە حەدیس كە بلێتن لەبەر خاتری پێغمبەر ﷺخوا دونیای دروست كردووە .

یاخود ئەو چیرۆكەش بلاو بۆتەوە كە دەلێن پێغمبەری خوا سێبەری نەبووە و كاتێك دەرۆیشت پێیەكانی دەنگی لێ نەدەهات بەهۆی رۆیشتنەوە ، كە ئەم باسەش هەم خورافیاتە و لە هیچ سەرچاوەیێك بوونی نیە وە هەم وادەكات لە سروشتی مرۆڤایەتی دەربچێت و پێچەوانەی ئایەتی : **قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا...** دەبێت ، بۆیت دەبێت هەول بدەین ئەم چیرۆكە دروست كراوانەش نەمێنن لەنێو كۆمەلگەی موسلمانان وە محمد ﷺوەك مرۆڤێك سەیر بكەین دواتر وەك پێغمبەرێك بۆ ئەوەی تەوحیدی موسلمانان نەروخێتن .

لێرەدا پرسیارێكی دیكە دێتە پێشەوە كەسی وا هەیە دەلێت بۆچی خوا مەلائیكەتێكی نەدەنارد یاخود بۆچی جنۆكەیێكی نەدەنارد بۆمان ئەمە چیە ئەم كەسە وەك ئێمە دەخوات و دەخواتەوە و لە بازار دێت و دەروات .. هەر لەسەردەمی پێغمبەریش ﷺكەسانی وا هەبوون و خوای گەورە بۆمان باس دەكات و دەلێت : **(فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ**

كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُرِيدُ أَنْ يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنْزَلَ مَلَائِكَةً مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ)﴿سورة المؤمنون ٢٤﴾

جا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لە دەستەی دەسەڵاتداری قەومەکەی وتیان: (گوێی بۆ مەگرن)ئەم پیاوە هەر کەسێکی وەك ئێوەیە، زیاتر نیە، دەیەوێت خۆی بکاتە گەورەتان!! ئەگەر خوا بیویستایە پێغەمبەرێك بنێرێت. ئـەوە فریشـتـەی دادەبەزانـد، ئێمـە ئـەم هەواڵـەمان لـەباوو بـاپیرانی پێشـووەوە نەبیستووە.

هەروەها لە ئایەتێکی دیکە دەفەرمووێ: (وَقَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الْآخِرَةِ وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ)﴿سورة المؤمنون ٣٣﴾

ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لە دەستەی دەسەڵاتداری قەومەکەی و بڕوایان بە پێشهاتی قیامەت و زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە نەبوو و لە ژیانی دنیادا لە نازو نیعمـەتی زۆر بـەهرەوەرمان کردبـوون وتیـان، ئـەم پێغەمبـەرە تـەنها بەشەرێکە وەك ئێوە، لـەو شـتانە دەخـوات کـە ئێـوە لێـی دەخـۆن و لـەو شتانەدەخواتەوە کە ئێوە لێی دەخۆنەوە.

هەموو گومانی ئەوان ئەوەبوو کە پێیان وابوو خوا مەلائیکەت دەنێرێت و پێیان وابوو محمد ﷺ دەیەوێت خۆی بکاتە گەورەی ئەوان و پێیان شتێکی سەیر بوو کە لەنێو ئەواندایە و خواردن دەخوات و شت دەخواتەوە .

باشه ئەگەر بپرسین گریمان خوای گەورە مەلائیکەتی بۆ مرۆڤ ناردبا ، تۆ بلێی ڕۆژانە کردارەکانی ئێمەی چۆن ڕێك دەخست بۆ نموونە چوونە بازار و شێوازی نان خواردن کە مەلائیکەت خواردن ناخوات و وەك ئێمە ناڕواتە بازار یاخود خەوتن مەلائیکەت خەوی نیە ئیتر چۆن بە ئێمە بلێت وا بخەون یاخود عیبادەتەکان خۆ عیبادەتەکانی وەك ئێمە نیە یاخود زەکات و ڕۆژوو گرتن و حەج کردن ئەمانە هەمووی مەلائیکەت جیاوازە لە هی مرۆڤ ، ئەوکات چۆن دەبوو ؟ یاخود تەنانەت پێغمەری خوا ﷺفێری کردین چۆن بڕۆینە شوێنی بەتاڵ کردنەوەی پاشەڕۆ ئیتر پێم نالێی مەلائیکەت چۆن ئەمەی کردبا ؟ یاخود بۆ هەندێك مەسەلەی زەوجی چۆن دەبوو مەلائیکەت ئەمانەی بۆمان شیکردبایەوە یاخو کۆمەڵێك شتی تایبەت بە ئافرەت کە پێغمبەرﷺفێری خێزانەکانی دەکرد و ئەوانیش فێری ئافرەتی موسلمانانی دیکەیان دەکرد ، هەر ئەمەش هۆکاری ئەوە بووە محمد ﷺئەم ژمارە زۆرەی ژن بهێنێت ، یاخود شێوازی حوکم ڕانی وەڵات مەلائیکەت چۆن ببا سەرکردەو پلانی بەڕێوە بردنی وەڵاتی بۆمان دانابایە ؟ ئەمانە و هەزار شتی دیکە کە ئێمەی مرۆڤ بە کردار پێغمبەر ﷺ بۆمانیٚ چارەسەر کردووە ، چونکە دەیزانی ئێمە چیمان پێویستە و چیمان پێویست نیە ، کۆتا بەهانای ئەوان ئەوەبوو پێغمبەر ﷺوەك ئێمەی مرۆڤ شت دەخوات و دەخواتەوە ! یٚ چی گۆڕا لە مەسەلەکە با شتەکانی وەك ئێمە بێت ئایا هیچ شتێك دەگۆڕێت لە ژیانی مرۆڤ کە چارەسەری کێشەکان نەکاتن ؟ بۆیە باشتر بوو پێغمبەر لە ئێمە بێت.

# محمد ﷺ نەخوێندەوار بوو

زۆرجار ئێمە دەبینین منالێکی زیرەك دیار دەکەوێت و لە قوتابخانە نمرەی باش دێنێت و کە گەورە دەبێت بەردەوامە لە زیرەکیەکەی خۆی ، بۆیە ئێمە سەیری دەکەین بزانین هۆکاری زیرەکی ئەم منالە چیە و بۆچی جیاوازە لەگەل کەسانی دیکە ، دەبینین باوکی دکتۆرە یاخود ماموستایە یاخود موهندسە ، ئەگەر باوکی وانەبێت دلنیاین دایکی پلەیێکی زانستی باشی هەیە بەلام ئەگەر دایکیشی هیچ پلەیێکی وای نەبێت ئێمە دەلێین بەراستی ئەم کەسە لێهاتووە و خوای گەورە بەهرەیێکی باشی پێداوە ، بەلام پاشان سەیری خوشك و برا گەورەکانی دەکەین و لەوانەیە وا گومان ببەین ئەوان کاریگەریان لەسەر هەبێت ، ئەگەر دەرکەوت ئەوانیش کاریگەریان نیە و هیچ شارزای زانست و قوتابخانە نین ، ئەوکات دەلێین بەراستی ئەم کورە موعجیزەیە چۆن لەخۆیەوە وا زیرەك و لێ هاتوو بووە !

ئەی بینیە پێش چاوی خۆت ئەم کەسە لە هیچ قوتابخانەیێکیش نەخوێندبێت و هەر لە مال بەبێ ماموستا زیرەك بووبێت و لەلای خۆیەوە هەولی دابێت و جار جاریش چووبێتە لای هەندێك ماموستا هەتاوەکوو هەندێك بابەت یارمەتی بدات ، ئەوکات دەلێن ئەمە ناچێتە عاقلی هیچ کەسێکەوە ، ئەی گریمان بلێین بەهیچ شێوەیێك نەچووە بۆ قوتابخانە و نەچووە بۆ لای هیچ

مامۆستایێك بۆ یێك جاریش ، بەتەنها لەماڵ کتابی خوێندبێتە هەر بۆیە وا زیرەك بووە ئەوکات باوڕ بەمە دەکەیت ؟

با هاوکێشەکەت بۆ قورستر بکەم ئەی ئەگەر ئەم کەسە لە هیچ شوێنێك نەیخوێندبێت و هیچ مامۆستای نەبووبێت و بۆ یێك جاریش کتابێکی نەخوێندبێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زیرەك و لێ هاتووە ئەوکات چی دەڵێی ؟ هەرگیزاو هەرگیز باوڕ ناکرێت و ناچێتە عەقلەوە ..بەلام محمد ﷺ کەسێك بوو لەسەردەمێك ژیا وە هیچ مامۆستایێکی نەبووە بەمانای کەلیمە وە ڕۆژێك لە ڕۆژان نەڕۆیشتووە بۆ قوتابخانەیێك وە ڕۆژێك لە ڕۆژان کتابێکی نەخوێندووتەوە و بەهیچ شێوەیێك نەیزانیووە ناوی خۆشی بنووسێت بۆ یێك جاریش ، واتە کەسێکی نەخوێندەوار بوو وەك چۆن خوای گەورە دەفەرمووێ : (وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ)﴿سورةتي العنكبوت ٤٨﴾

تۆ ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، بە دەستی خۆیشت هیچ شتێکت نەنووسیووە، (چونکە نەخوێندەوار بوویت) خۆ ئەگەر شتیکی وات ئەنجام بدایە، لەو کاتەدا نەفام و دەم بە تاڵەکان دنیایان پڕ دەکرد لە شك و گومان (کە گوایە قورئان لەدانان و داڕشتنی تۆیە).

چۆن دلنیا بینەوە کە نەخوێندەوار بوو : سەرەتا بۆ موسلمان ئایەتی قورئان یێکلا کەرەوەیە و بێ هیچ شتێك وەردەگرێت و باوڕ بە قورئان دەکات ، بەلام چۆن بۆ نا موسلمانان بسەلمێنین کە محمد ﷺ نەخوێندەوار بووە ، هەرچەندە

گریمان ئەگەر خوێندەواریش بووایە ئەوا هیچ گومان بۆ کەسانی خاوەن ژیر دروست نەدەبوو ، بەلام نەفامەکان ئەکەوتنە گومانەوە ئەوکان و دەیان وت محمد خۆی ئەم قورئانەی دروست کردووە ، بۆیە پێم باشە بە چەند خالێك بزانین محمد ﷺنەخوێندەوار بووە .

یێکەم : ئەوانەی دەلێن خوێندەوار بووە فەرموو سەیری هەموو مێژوو بکەن و هەموو ژیان نامەی محمد ﷺبێنن و سەیری بکەن تەنها یێك ماموستامان بۆ بێنن کە رۆژێك لە رۆژان وانەیێکی فێری محمد ﷺکردبێت ، تەنها یێك ماموستا هیچی دیکەمان ناوێت .

دووەم : فەرموون بە هەمووتان ناوی ئەو قوتابخانەیە بلێن کە محمد ﷺلێی تەواو بووە ، ئەگەر کەسێکی خوێندەوار بوویێتن .

سێیەم : ناوی یێك کتێب بۆمان بێنن کە محمد ﷺبەیارمەتی ئەو کتێبە فێرە خوێندەواری بووە ؟

چوارەم : فەرموون یێك قسەی دوژمنەکانی محمد ر بێنن کە باسی ئەوەی کردبێت محمد ﷺخوێندەوار بووە ، چونکە لۆژیکی نیە کەسێك چل سال ژیابێت هیچ لە دوژمنەکانی نەزانن خوێندەوار بووە یاخود نا ، ئەی بۆچی رۆژێك پێیان نەدەوت تۆ خۆت قورئانت نووسیووە ، چونکە خوێندەواری باش دەزانی ، ئەی بۆ پێیان دەوت ساحر ، کاهن ،....هتد بەلام پێیان نەدەوت خوێندەوار یاخود نووسەر ؟

پێنجەم : بۆچی ڕۆژێك لە ڕۆژان یێكێـك لـە خێزانـەكانی ئـەو شـتێكی بـاس نەكردووە كە بلێت محمد ﷺ خوێندەوار بووە و لەماڵەوە شت دەنووسێت ، چونكە لۆژیكی نیە ئەم هەموو خێزانە بەزێزەی هەبووە یێكێك ڕۆژێك شتێكی باس نەكردبێتن ؟

شەشەم : پێغمبەر ﷺماوەی چل ساڵی پێش دابەزینی قورئان ژیاوە لـەناو مەككە باشە كەسێك خوێندەوار بووبێت بەتایبەتی ئەوكات حەزیان لە شعر بووە بێ گومـان هـەوڵ دەدات شـعر بنووسـێت باشـە بـۆ محمـد ر شـتێكی نەنووسیووە لە شوێنێك كە هەر هیچ نەبێت ئامادەكاری بكات بۆ ئەو كارەی دەیكات لە داهاتوودا مادەم ئێوە دەڵێن خوێندەوار بووە .

# ئەگەر پێغمبەر ﷺ لەم سەردەمە هاتبا

دەزانم ناونیشانێکی سەیرە ، بەلام حەزدەکەم هەندێك شت بوروژێنم ئەویش بێنە خەیالی خۆت دونیا لەرووی پێشکەوتن وەك ئیستا بوایە لەجیاتی ئەوەی ١٤٤٠ پێش ئیستا محمد ﷺ بۆ مرۆڤایەتی بێتن ، ئەم سەردەمە هاتبا چی دەکرد ؟

من حەدم نیە بەناوی ئەو قسە بکەم یان لەجیاتی ئەو شت بلێم هەرچەندە ئەم شتە مەحالیشە ، بەلام وەك گریمان باسی دەکەین چی دەبوو ؟ من خۆم کە سەردەم سەردەمی تەکنەلۆژیایە و سۆشیال میدیا جیهانی داگیر کردووە لە شوێنێك ئەم پرسیارەم وروژاند کە پێشتر لەلایەن چەند کەسێکی دیکەش ئەم پرسیارە کراوە ئایە چۆن دەبوو ، هەندێك دەیان وت ئەم پرسیارە هەلەیە و نابێت بکرێت ، بیٚ ئاگا لەوەی من وەك گریمان دامناوە ، هەندێکی دیکە دەی وت یێکەم شت ئەم حزبە ئیسلامیانە ناهێلێت کە حزبایەتی بکەن ، چونکە حزبایەتی لە ئیسلام دروست نیە و رێگە پێدراو نیە ، یێکێی دیکە دەی وت سەلەفیەکان بێدەنگ دەکات ، چونکە هەموو شتێکیان لە موسلمانان بەزەحمەت کردووە و کردویانە بە بیدعە ....هتد ، ئەمانە کۆمەلێك وەلام بوون بەلام پێم وابێت ئەگەر سەیری پرسیارەکە بکەین وەلامەکان هەلەن ، چونکە ئەو وەلامانەی ئەوان باس دەکەن لە کاتی هاتنی پێغمبەر ﷺ لە سەردەمی خۆیەتی نەك ئێستا ، چونکە من دەلێم ئەگەر ئیستا بێت نەك ئەوکات خۆ ئەگەر ئەوکات نەهاتبا ئەم حزبە ئیسلامیانە و سەلەفیەکان

**بوونیان هەر نەدەبوو هەتاوەکوو بێگۆرێت ، ئەگەر من وتبام ئەگەر پێغمبەر ﷺ زیندوو ببێتەوە چی دەکرد ئەوکات رێی تێدەچوو وەلامی ئەوان دروست بێت ، بەلام من دەلێم لەجیاتی ئەو سەردەمە ئەم سەردەمە هاتبا چی دەکرد ؟**

**وەك لە سەرەتا وتم من حەدم نیە لەجیاتی ئەو قسە بکەم ، بـەلام هەنـدێك پرسیارتان لیٚ دەکەم خۆتان وەلامەکەی بدەوە ..**

**ئەگەر پێغمبەر ﷺ لەم سەردەمە هاتبا لەجیاتی ئەوەی حوشتر بەکار بێنێت ئایا سەیارە و تەیارەی بەکار نەدەهێنا ؟**

**ئەگەر پێغمبەر ﷺ لەم سەردەمە هاتبا لەجیاتی ئەوەی نامە بۆ سەرکردەکان بنێرێت بە هاوەلەکانی ئایا تەلەفۆن و ئامێرەکانی دیکەی بەکار نەدەهێنا ؟**

**ئەگەر پێغمبەر ﷺ لەم سەردەمەدا هاتبا لەجیاتی ئەوەی هەر چەند خولەکێك لە شوێنك بوایە ئایا هۆلێکی گەورەی نەدەگرت و سیمیناری رێك نەدەخست ؟**

**هەر بەراست پێت دەلێم سۆشیال میدیای بەکار نەدەهێنا ؟ و تەنانەت پێت وانیە پەیجی دروست نەدەکرد ؟**

**هەر بەراست کۆبوونەوەی لەگەل سەرکردەکان نەدەکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهان ؟**

هەر بەراست قسەی لەسەر سایتە بێ رەوشتیەکان و مەلهاکان نەدەکرد ؟

هەر بەراست باسی ئەم هەموو بارەی نەدەکرد کە بوونیان هەیە ؟
هەر بەراست باسی ئەم نەتەوەپەرستیەی نەدەکرد کە زۆربەمان تووشی بووین ؟
هەر بەراست تۆ بلێی باسی تۆپی پێی نەکردبا ؟
هەر بەراست پێت وایە باسی زانستەکانی ئیستای نـەکردبا و هـانی خـەلکی نەدەدا هەتاوەکوو فێربن ؟
هەر بەراست بێدەنگ دەبوو لەم هەموو زولمەی ئەم سەرکردانە ؟
هەر بەراست زانکۆ و پەیمانگای نەدەگۆرین لەرووی مەنهەجەوە هەتاوەکوو قوتابیان بەرهەمیان هەبێت ؟
هەر بەراست وەکوو زۆربەی ئەم مەلایانەی ئیستا دەبوو بە عەلمانی و دەی وت دین دەبێت لە دەولەت جیابکرێتەوە ؟

بۆیە دەبێت ئێمەی موسلمان سوود لە شتەکان وەربگرین و رەچاوی زەمان و مەکان بکەین نەك خۆمان پێ نامۆ بێت و خۆمان جیابکەینەوە لە کۆمەلگە ، من نالێم تەنازول لە ئیسلام بکە ، بەلکوو دەلێم واقع بین بە و بـەپێی کـات وزەمـان بزانــە چـی پێویسـتە بیکـەین و چـۆن سـوود وەرگـرین لـەوەی لەبەردەستمان دایـە بـۆ ئـەوەی بتـوانین بانگـەوازێکی سـەرکەوتووبکەین و بەرهەمی هەبێتن .

# بۆچی ئەشکەوەی حەرا

پێغمبەری خوا ﷺدوای ئەوەی بینی قورەیش لـە چ ڕەزالـەتێك و سـتەمێك دەژیتن هەستی دەکرد هەلەن ، بەلام نەیـدەزانی چـۆن بانگـەوازی بکـات و بەدیلێکی دیکەی نەبوو ، بەلام هەر خەمی خەلکەکەی بـوو خـۆی بـە نـامۆ دەبینی لەنێو قەومەکەی ، سروشتی مرۆڤیش وایە کاتێك جیاواز بێت لە نێو کۆمەلگایێك ئەوا هەمیشە پێی خۆشە بەتەنها بێت و دوور لە زولم و ستەمی کۆمەلگاکەی بۆیە پێغمبەری خوا ﷺدەیزانی نەتەوەکەی هەلەن و فیترەتی مرۆڤیش خۆی لەخۆیدا هەست بە بوونی خوایێك دەکات وەنەبێت قـورەیش باوری بەخوا نەبووبیَ بێت و لای ئەوان شتێکی نامۆ بێـت ، ئـەوان باوریـان بەخوا هەبوو تەنانەت ابو جهل لە شەرێك دژی موسلمانان پێش ئەوەی دەست پێبکات دەست دەکات بە دوعا کردن و لەخوا دەپارێتەوە ، بەلام لەهەمان کاتدا ئەوان چەندین بتی دیکەیان دروست کردبوو و پێیان وابوو بەهۆی ئەوانە لەخوا نزیك دەبنەوە بۆیە دەیانپەرست .

محمد ﷺتێگەیشـتبوو پێویسـتی بـە تەنهایـە بـۆ ئـەوەی هـەر هـیچ نـەبێت خەمەکانی کەم ببێتەوە ، ئەگەر بۆ کاتێکی کەمیش بێت دوور کەوێتەوە لەو بت پەرستیە و ماوەیێك خەمی خۆی بۆ خوای خۆی بلێت و دل و دەرونی ئارام ببێتن ، بۆیە رووی کردە ئەشکەوت کە چەند کیلۆمەترێکی کـەم لـە شـاری مەککە دوور بوو بۆ ئەوە دەرۆیشت بۆ ئەویَ هەتاوەکوو هەست بـە ئـارامی بکات و بیربکاتەوە ، چونکە زۆر خەمی نەتەوەکـەی دەخـوارد کاتێـك بـەم شێوەیە دەیبینی .

خالێکی دیکە کە نابێت فەرامۆشـی بکـەین ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە ئـەم پێغمبەرە نازادارەی پەروەردە کردبوو و هەر لە منالی بەشی شـەیتانی لـێ جیاکردبووە بۆ ئەوەی هیچ شتێك کاریگەری لەسەری نەبێتن .

لە قورئاندا هەر لەسەرەتادا هەموو گومانێك پوچەل دەکاتەوە بەوەی کەسێك بلێت کێ نالێ لەوێ خەریکی نووسینی قورئان بووە یاخود کەسێك لەگـەلی بووە و کۆبونەوەیان لە ئەشکەوت کردووە بۆ ئەوەی قورئان بنووسن ، لـە وەلامدا بە چەند خالێك هیچ یێکێك لەو گومانانە ناهێلین و شوێنیان نابێتەوە هەر لەسەرەتا دابەزینی وەحی

یێکەم  ئەگەر لە ئەشکەوتی حەرا کۆبونەوەیان کردووە بۆ رۆژێك لـە رۆژان کەسێك یێکێکی دیکەی نەبینووە لە ئەشکەوت یاخود لە رێگادا کـە بـەجیا یاخود پێکەوە لەگەل محمد ﷺ چووبن بۆ ئەشکەوت ، یاخود کەسێك باسی نەکردووە کە ئەویش رۆژێك لە رۆژان لە ئەشکەوت لەگەل ﷺبووە وە بەژداری کردووە لە نووسینی قورئان ، ئەی بەرژەوەندی ئەوانی دیکە چی بووە لەوەی بەژداری بکەن و هیچیان بۆ نەمێنێتەوە ؟

دووەم  لە قورئاندا ئایەتەکان سبب نزولیـان هەیـە واتـە هۆکـاری دابـەزینی ئایەتـەکانمان هەیـە پێمـان نـالێن چـۆن ئـەوە دەگونجێـت لـەوەی پێشـتر نووسیبیان و دواتر سبب نزول بونیان هەبێت ؟ چۆن پێشتر نووسراون ئەگەر سبب نزولیان هەبێت ، یاخود ئەوانـەی دەلـێن لـە مەسـیحی و زەرەشـتی و یۆنانیەکان وەرگیراوە ئەم دینە ئەوان چـۆنیان زانیـوە لەگـەل روداوەکـانی ئەوکات دەگونجێت و سبب نزولیان هەبێت یاخود کۆمـەلێکی دیکـە دەلـێن پێشتر وەرەقەی کوری نەوفەل بۆی نووسیووە ئەی ئەو چۆن زانی کە بەپێی زەمان پێویستە فلان ئایەت بنوسرێت یاخود کام شت رودەدات تا ئایەتێکی بۆ

بنوسیّ ، خۆ دوای هاتی وەحی بۆ پێغمبەر ﷺ بە سێ سال وەرەقە کـوری نەوفەل وەفاتی کۆچی دوای کرد ، کەواتە چۆن ئەو شتەکانی ٢٠ سالی دوای وەفاتی دەزانێت کە چی رودەدات ؟

محمد ئەو چۆن دەتوانێت بوێرانە شتێك بنوسێت و بلێت با مرۆڤ و جنەکان کۆببنەوە و بتوانن سورەتێك بێنن وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ، یاخود بلێت ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تیا نیە ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ، یاخود دوای ١٤٠٠ زیاتر هیچ کەسێك نەتوانێت هەلەیێکی لێ بدۆزێتەوە ، ئەمانەو هەزاران بەلگەی دیکە هەن کـە دەسـەلمێنێت قورئـان لەلایەن خوای گەورەیە نەك مرۆڤ بۆ ئەم باسەش زانایانی پێشوو و ئیستاش چەندین کتابی تایبەت بەم باسەیان داناوە دەتوانی زیاتر لەسەر ئەم باسـە بزانی .

# تەمەنی خاتوو خەدیجە

زۆرجار ئێمە لێرە و لەوێ دەبینین کە کاتێك باس لە تەمەنی خاتوو خەدیجە دەکرێت کاتێك شووی بە پێغەمەری خوا ﷺکردووە دەڵێن ٤٠ ساڵ بووە و پێغمبەری خواش محمد ﷺ٢٥ ساڵ بووە ، بەڵام کە سەیری مێژوو و بەڵگەکان دەکەین شتەکە پێچەوایەنەیە و هیچ راستییێکی بۆ نیە ...

سەرەتا ئەگەر سەیری بکەین هیچ حەدیسێکمان نیە باس لەوە بکات تەمەنی خاتوو خەدیجە ٤٠ ساڵ بێت کە شووی بە پێغمبەر محمد ﷺکردووە ، بۆیە ناچارین سەیری رای زانایان بکەین بزانین چی دەڵێن لەسەر ئەم باسە ..

امام البیهقی لە کتابی دلائل النبوە دەڵێت تەمەنی خاتوو خەدیجە ٢٥ ساڵ بوو کە شووی کردووە بە پێغمبەر ﷺوە تەمەنی ٥٠ ساڵ بووە کە کۆچی دوای کردووە ، وە هەروەها البزاری لە پەرتوکەکەی بەناوی انساب الاشراف دەڵێت تەمەنی ٤٩ ساڵ بووە کاتێك کۆچی دوای کردووە ، ابن کپیر رەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت تەمەنی ٥٠ ساڵ بووە کاتێك کۆچی دوای کردووە ، زانای گەورەش نیسابوری هەر هەمان رای هەیە کە ٥٠ ساڵ بووە کاتێك کۆچی دوای کردووە ، محمد بن اسحاق هەمان رای ئەوانی هەیە .

تاکە رای جیاواز هی نیسابوریە کە دەڵێت تەمەنی ٤٩ ساڵ بووە وە محمد بن اسحاق دەڵێت خاتوو خەدیجە ٢٨ ساڵ بووە کە شووی کردووە بە پێغمبەر ﷺکردووە و دەڵێت خاتوو خەدیجە ٢٥ ساڵ ژیاوە لەگەڵ پێغمبەر ﷺ ، ئەگەر هەردووکی کۆبکەینەوە دەکاتە ٥٢ ساڵی بەرای محمد بن اسحاق لە پەرتوکی تاریخ الخمیس باسی کردووە .

## وتەی کۆتـای نووسەر

لە کۆتای دەلێم داواکارم لە خوا لە کەم و کورتیـەکانمان ببوورێـت و هــەر هەلەییێکم کردبێت لەخۆمەوەیەوە وە هەرشتێکی راستیشم وتبێت لە خوایە و مـن سوپاسـگوزاری ئـەوم ، وە بـۆ سەرچـاوەکانیش کـە راسـتی روداوەکـە ئەسەلمێنن زۆرێك لە پەرتوکەکان هەن تایبەت بە ژیان نامەی پێغمبەر ﷺ، بەلام پەرتوکە نایابەکەی گولاوی سەرمۆرم کردووە بە سەرچـاوەی راسـتی روداوکان ، چونکە یێکێکە لە باشترین و بەهێزترین پـەرتوکەکان تایبەت بـە ژیانامەی پێغمبەر ﷺ

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام علي أشرف المرسلين سيدنا محمد وعلي آله وصحبه أجمعين.**

## پێرست: